و نێچیر بخەنە داویان و بە دەردی ئیلحاد گیرۆدەی بکەن، لە بەرانبەریشدا خوێندنەوەی پەڕتووك و بڵاوکراوەی ئیلحادی لە لایەن گەنج و لاوەکان و بە هاناوەچوونی بانگەوازە ئیلحادییە جیهانییەکە لە لایەن خەڵکانی بێئەزموون و نەشارەزای باسە ئیلحادییەکان، هەروەها بەداوەوە بوونیان بە چیرۆکە قەڵبە ئیلحادییەکان، کە بەشێکی ئەو پێوەدراو و نێچیرانەش ڕەنگە لە سەرەتای کاروانەکە مەبەستیان وەڵامدانەوە و هەڵکوتان بووبێت بۆ سەر پەڕاوی تاڵ و قەڵبی ئیلحاد، بەڵام ئاکامێکی ناپەسەند یەخەی گرتوون و بوونەتە تێوەگلاوی نەخۆشی ئیلحاد.

**٨-** ئیلحادی ڕۆژئاوا بەشێکی باشی لە ژێر سەری دەسەڵاتە ناڕەوا و قۆرخکارییەکانی قەشە و کڵێسادا بەرهەمهاتووە، لەبەرئەوەی سەرسەختانە دژایەتی زانستی دەکرد بە ناوی خودا و بە ناوی دینەوە، هەڵسوکەوتە خراپەکانی دەسەڵاتی دەشەرعاند و لە دژی چینی ڕەش و ڕووت کەوتبووە بەرەی دەسەڵات و سەروەت و سامانی لەگەڵ دابەش دەکرد.

بەڵام لە هەمووی قێزەونتر دژایەتی سەرسەختانەی زانست و پێشکەوتنی زانستی بوو، بە ئەندازەیەك هەزاران زانای وەك کۆپەرنیکۆس و گالیلۆیان دەکوشت یان ناچار بە تۆبەکردنیان دەکردن، بەڕاستی ئەوان سەردەمێکی تاریك و نەگونجاویان بەدیهێنابوو نەیاندەهێشت زانست پەل بهاوێت و زاناکانیان دارکاری و مەرگبار دەکرد، بەوەش لە دوای ڕێنسانس و شۆڕشی فەڕەنسا

زانست و کۆمەڵگە هەلێکی باشیان بۆ ڕەخسا تۆڵە لە ئایین بکەنەوە، کە ئەو گڕەی بۆ کڵێسا خۆشکرا پڕپشکەکانی ئیسلامیشی گرتەوە.

٩- سیستەمی سەرمایەداری ئازادانەی ڕەهای ئەمڕۆ کارەساتی گەورەی مرۆڤایەتی ناوەتەوە لە ڕووی دابەشکردنی کۆمەڵگە بۆ کەمینەیەکی پڕ و زۆرینەیەکی قڕ.

لە هەر وڵاتێکیشدا هەژاری بڵاوبوویەوە کڕینی بیروباوەڕی خەڵکی تێیدا هەرزان و ئاسان دەبێ، یەکێك لە هاوەڵان وتویەتی: (إذا دخل الفقر بلدا يقول له الكفر خذني معك)، واتا: ئەگەر هەژاری بچێتە شار و وڵاتێکەوە کوفر و بێباوەڕی پێی دەڵێت: لەگەل خۆت بمبە.

١٠- نەمانی دەسەڵات لای بەرەی ڕاستڕەو و گرنگیدانی بەرەی دەسەڵاتی چەپ بە بارە ئیلحادییەکە هەتا خەڵکی بە بابەتی لاوەکی لە ڕێی دەسەڵات شڵۆق و سەرقاڵ بکات و کاتی لاکردنەوەیان بەرەو دەسەڵات نەمێنێت و ئەوانیش چۆنیان بوێت بەو شێوە لێیان بخوڕن.

١١- پێشکەوتنە زانستییەکان و لاوازبوونی ئایینەکان بەرانبەری، کە بەو پێشکەوتنە زانستییە دنیای تۆڕی کۆمەڵایەتی زەبری بڕەندە و کوشندەی لە ئاییندا و هەر کەس هەر فکرە و بیروبۆچوونێکی لاوەکی گوشراو لە بیروباوەڕەکانی خۆی هەبێت دەتوانێت بە خێراییەکی سەیر و ئاسان بە دنیادا بڵاوی بکاتەوە.

**١٢-** گەورەبوونی بنەهەڕەمی ناباوەڕی و زیادبوونی ژمارەیان ڕەنگە لە هاوڕێیەتی و پەیوەندی کردنی کەسانی ناباوەڕیشەوە سەرچاوە بگرێت بە تایبەت ئەگەر کەسێکی باوەڕلاواز و کەم توانا لە زانیاری و جیهانبینی و بەرچاو ڕوونیدا هاوڕێ بێت لەگەڵ کەسێکی بێباوەڕی دەم هەراش و زۆرزان و فرت و فێڵچیدا، کە دەکرێت زۆر ئاسان ڕام بکرێت و بە پەردەی ئیلحاد بەری چاوی بگیرێت.

**١٣-** دەکرێت بوترێت هەموو لایەن و هۆکارەکانی دیکە بە هێندەی میدیا نەیانتوانیوە و ناتوانن کاریگەری نێگەتیڤیان لەمەڕ بێباوەڕیدا هەبێت بەشێوەیەکی گشتی و کاریگەر، لەو بارەوە برەوپێدەرانی بێباوەڕی چەکوشی میدیا بەکاردەهێنن و ئەوەی دەیانەوێت لە گومان و دوودڵی دەربارەی دژ بە ڕاستییەکان دەیئاخننە گوێ و مێشك و دەروونی مرۆڤەکان بەبێ جیاوازی و کاریگەری تەواویان لەسەر دادەنێت، ئەویش بەهۆی ئەو چەواشەکارییانەی کە لە هەواڵ و ڕووداو و تێزە جیاوازە فەلسەفی و زانستی و لۆجیکییەکاندا بوونی هەیە.

میدیا دەتوانێت ڕاستییەکان بگۆڕێت و هەواڵەکان چەواشە بکات و ئەوەی نەیویست بڵاوی نەکاتەوە و ئەوەی ویستی لە ئاستی خۆشی بیباتە دەرەوە و مەبەستی خاوەن میدیاکان بە ئاسانی لە ماوەیەکی کورتدا بە هەموو جیهان بگەیەنرێت، لە هەموویان خراپتر بەو بەرنامەیەی کە میدیا هەیەتی دەتوانێت کۆمەڵگە

ئاڕاسته بكات بەرەو لایەك كە چەپگەراو بێباوەڕینی دەسەڵات ڕازی بن و بیانەوێت، میدیا زۆر ئاسان دەتوانێت گەنجەكان بوروژێنێت و كەلتورەكان بگۆڕێت و گومان و دوودڵی بخاته دڵی هەر كەسێك لەسەر هەر بوارێك كە مەبەستی بێت.

**١٤-** له هـــۆكاره زەق و ناســـازەكانی ئیلحـــاد ڕۆچـوونه لەنێو ئارەزووبازیدا، چونكه ناباوەڕی پاساوێكی لەباره بۆ پڕكردنەوەی ئارەزوو و حەزه ئاژەڵییەكانی مرۆڤ.

وەك دیاره ئیلحاد پابەند نییه به هیچ ڕێڕەوێكی ڕەوشتی و هیچ جۆره ڕەوشتنامەیەك جێبەجێ ناكات، بەڵكوو ئەوەی حەزیان لێیەتی و دەتوانن دەستەبەری بكەن دەیكەن، هەر لەو كاتەوەی كەسێكی ناباوەڕ ئیعلانی ناباوەڕییەكەی كرد، ئەوا زۆر ئاسان دەتوانێت بەبێ شەرمەزاری مومارەسەی ئارەزووە ئاژەڵییه نالەبارەكانی بكات و لەو قەید و بەنده نەخوازراوه ڕزگاری دەبێت كه خوداناسی و ئایینەكان بەسەرشان و ملیدا دێنن و دەست و پەلی دەبەستن، ئەم گۆڕانكارییەش دەرفەتێكی ناوازەیه كه زۆربەی مرۆڤەكان دەیقۆزنەوه و ناهێڵن له كیسیان بچێت هەتا ئەوەی كه چێژ لەو دنیا خۆشه پڕ جوانییه وەرگرن و هیچ یاسا و ڕێسایەكیش نەیانبەستێتەوه، ئەم هەنگاوەی بێباوەڕانیش وا دەكات كه كەسانێك له ئەوپەڕی خۆشگوزەرانی و ژیانكردن و چێژوەرگرتندا بن و ئەوانی دیكەش نەك هەر زەقەی چاویانه

و ناتوانن چێژ وەرگرن، بەڵکوو دەبنە قوربانی هەوا و ئارزووە ماددی و غەریزییەکانی بەشە کەمینەکە.

**١٥-** ڕەنگە هەموو جارێك بەرەی ناباوەڕان تاوانباری سەرەکی نەبن، بەڵکوو ئەو نمایشە دزێوەی بەشێك لە بانگەشەکاران و ئایینزا و مەلا و خۆ بە دۆست زانانی ئایین دەیکەن ڕەنگدانەوەیەکی زۆر نالەبار و ناحەز لە ناخی گەنج و لاوەکان تەنانەت دنیا دیتوانیش دەسازێنن، زۆر جار بانگەشەکار و بانگوخوازانی هیچ لەباردا نەبوو برینی قووڵی جەستەی ئایین و باوەڕن، زۆرەملێیانە پاڵ بە خەڵکییەوە دەنێین هەتا لە ئایین و خوا و باوەڕ دەستیان بەربێت و پاشەکشەی لێبکەن.

کاتێك هەندێك لەوانەی بە ڕاستی پرسیاریان هەیە و لەگەڵ پرسیارەکانیان ڕاستگۆن و لە مێژووی ئایینەکان دەپرسن و دەدوێن تووشی شۆك دەبن، کاتێك کە لە بچووکی باڵای زانستییانەوە ناتوانن شیکاری گونجاو بۆ دەق و یاسا ئایینییەکان بکەن، یان ناتوانن ڕاڤەیەکی تەندروست بدەن بە ئایین و دەق و پەڕاوە ئایینییەکان، ئیتر لەناخیانەوە گومان و ناڕوونی بەرانبەر دەقەکان پاڵیان پێوە دەنێت تا کاتێك خۆیان لەنێو ئەندامانی کاروانی ئیلحادییەوە دەبیننەوە.

**١٦-** یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکانی ئیلحاد سیستەمی پەروەردە و فێرکردنە کە دەبنە هۆی:

- بە لاڕێدا بردنی بابەتە ئایینییەکان لەنێو خوێندندا

- دانانی مامۆستای نەشارەزا و بێتوانا پەروەردەنەکراو

- بێقەدرکردنی خوێندنگا و پەیمانگا ئایینییەکان

- یان ڕێکخستنی چالاکییەکان بە شێوەیەك کە خزمەت بە ونبوونی گەنجان بکاتدا



## چارەسەرەکانی ئیلحاد



چارەسەر بۆ ئیلحاد و هەموو تەوژم و ڕەوتە ئیلحادییەکان و هەموو لادانە فکرییەکان بریتییە لەمانە:

١- چاندن و بەهێزکردنی بیروباوەڕ (عەقیدە)یەکی ڕاست و دروست، پشت بەستوو بە قورئان و سوننەی صەحیح و بەڵگەی ئەقڵی و فیکری و زانستی، نەك عەقیدەیەکی وشك و سادە و ساکار کە بەرگەی گومانی بێباوەڕان نەگرێت، چونکە بەڕاستی ئێمە کێشەیەکمان هەیە ئەویش بریتییە لەوەی کە عەقیدە دەخوێنرێت، بەڵام کەم جار وایە پشت ئەستوور بێت بە بەڵگەی ئەقڵی و لۆژیکی و زانستی. زۆر جار هەندێك کەس حەساسییەتیان بە ئەقڵ هەیە، کە لە ڕاستیدا نابێت وا بێت، چونکە کە ئەوان دێنە مەیدان بانگەشەی فیکر و ئەقڵ و زانست دەکەن ئەگەر چی نە فیکر و نە ئەقڵ و نە زانست پشتگیرییان ناکات، دەی ئەوەش بانگەشەیەکی بێبنەمایە.

لە پاشاندا گشتاندنی ئەم جۆرە عەقیدەیە بە نێو ئاستە جیاوازەکانی کۆمەڵگەدا، بەتایبەت جیلی گەنجان، ئەمەش بە ڕێگای جیاواز جیاواز، بۆ نموونە لە ڕێگای دەرسی تاکەکەسی، دەرسی گشتی، موحازەڕات، بەرنامەی ڕادیۆیی و تەلەفزیۆنی، تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، بڵاوکراوە، گۆڤار و... هتد.

٢- بەهێزکردنی بنەما ئایینی و فیکری و عەقیدەییەکان بە بەڵگەی ئەقڵی، فەلسەفی، فیکری، زانستی و لۆژیکی.

٣- سوود وەرگرتن لە ئامڕازە جیاوازەکان بۆ گەیاندن و بڵاوکردنەوە و ڕەواندنەوەی گومانەکان، هەروەها ئامڕازی نووسین و ڕاگەیاندن و دروستکردنی ڕێکخراو و سەنتەر و قوتابخانە و... هتد.

٤- ئاگادارکردنەوە و هۆشیارکردنەوەی خەڵکی بەگشتی و گەنجان بەتایبەت لە تێکەڵبوون و خوێندنەوەی پەرتووکی ناباوەڕی و بێباوەڕی کە بەس گومانیان خستووەتەڕوو بەبێ وەڵامدانەوە و ڕەواندنەوەی گومانەکان، چونکە ئەم کەسە یان ئەم گەنجە تاوەکوو ئێستا بۆ خۆی شارەزاییەکی وای لە ئیسلام و قورئان و فیکر و فەلسەفەی ئیسلام نییە، چ پێویست دەکات تۆ هێشتا لەوانە شارەزاییت نەبێت بچیت خەریکی ئەوانی دیکە بیت؟!

٥- زیندووکردنەوەی زانستە ئیسلامییەکان و شەرعییەکان، نوێکاری تێیاندا و خستنەڕوویان بە شێوازێکی جوان و ئاسان و سەردەمییانە و خۆشەویستکردنیان لەبەر چاوی خەڵك و هاندانیان بۆ نزیکبوونەوە لێی و خۆ تەرخانکردن بۆیان.

٦- گرنگیدان بە بابەتە ئیمانی و ڕۆحییەکان و زیندووکردنەوەی دڵ و دەروون و ڕاهێنانی خەڵکی لە تام و چێژ وەرگرتن لە عیبادەت، نەوەك وەرگرتنی ئەمانە وەك عادەتێك، بۆیە دەبینین زۆربەمان کە نوێژ دەکەین ئاگامان کەم لە نوێژەکانمانە کە دیارە

نوێژ قسەکردن و موناجاتە لەگەڵ خودای گەورە، بۆیە کەم تام و چێژی لێوەردەگرین و ڕەنگدانەوەی دەروونی و ڕۆحی و دەرەکی و کردەیی زۆر کەمە -بەداخەوە-.

٧- تێگەیشتن لە قورئان و سوننەت بە تێگەیشتنێکی ڕاست و دروست و واقیعییانە و دوور لە شلگیری و توندڕەوی، هەروەها ڕەچاوکردنی مەبەستەکانی شەریعەت (مقاصد الشريعة) لە کاتی تێگەیشتن و جێبەجێکردن و دابەزاندنی بۆ نێو کۆمەڵگە.

٨- دەرخستنی جوانییەکانی ئیسلام (محاسن الإسلام) لە هەموو بوارەکاندا، وەك: بواری فیکری، عەقیدەیی، تەشریعی، یاسایی، عیبادەتی، سیاسی، ئابووری، ڕەوشتی و... هتد.

٩- گرنگیدان بە زانستە ئەزموونییەکان (تەجریبییەکان)ی وەك فیزیا و... هتد، هەروەها بەکارهێنانیان بۆ پشتگیری و پاڵپشتی بنەما عەقیدەیی و دینییەکانی ئیسلام، چونکە تا ئێستاش زۆرێك لەم زانستانە لە دەستی ڕۆژئاوادان و بە کەیفی خۆیان بەکاری دەهێنن.

١٠- گرنگیدان بەو کەسانەی لە وڵاتانی دەرەوە و ڕۆژئاوادا دەژین، بۆ تێگەیاندنیان و پێگەیاندنیان و پاراستنیان لە لادان و بە لاڕێدا بردن.

١١- بەدواداچوون و لێکۆڵینەوە بۆ ئامراز و هۆکارەکانی ناباوەڕی و هەوڵدان بۆ وشککردن و نەهێشتنیان.

**١٢-** وەڵامدانەوەی گومانەکان بە شێوازێکی جوان و زانستی و فیکری و قەناعەتپێکەر.

**١٣-** بەکارهێنانی حیکمەت و دانایی لە وەڵامدانەوەی ناباوەڕی و بێباوەڕان، دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی مەنهەجی نازانستی و نالۆجیکی و جنێو و تەشهیر و زمانی زبر.

**١٤-** هەتا بکرێت گفتوگۆکان تاکەکەسی و پەنهان بێت لەگەڵ بێباوەڕان، بە ئامانجی هیدایەتدان و ڕێنموونیکردنیان. بەڵام ئەگەر بە ئاشکراو لەبەر چاوی خەڵك بێت، ڕەنگە ئەم ئامانجە نەپێکێت و کەسەکە لەبەر کەسایەتی خۆی نایسەلمێنێت و داننانێت بە ڕاستییەکاندا. ئەمە بەشێوەیەکی گشتی وایە، ئەگەرنا ڕەنگە هەندێك بارودۆخ وا بخوازێت کە ڕووبەڕوو لەنێو خەڵك لەگەڵیان دانیشی و گفتوگۆیان لەگەڵدا بکەی و بەتایبەت کاتێ ئەوان داوای دیبەیت و گفتوگۆ دەکەن و تەحەددا دەکەن و بەبەهێزی خۆیان نیشان دەدەن.

**١٥-** کەسانی شارەزا و تایبەتمەند هەستن بە وەڵامدانەوە و گفتوگۆکردن و دیبەیتکردن، نەوەك کەسانێکی نەشارەزا کە بابەتی گومانەکە پسپۆڕی ئەوان نەبێت. لە ڕاستیدا دەبێت بوارەکان لێك جیا بکرێنەوە نەوەك بەو تێکەڵییەی ئێستا دەبینرێت کە کەسێك لە هەموو بوارەکان قسە و گفتوگۆ و دیبەیت دەکات. بە ڕاستی ئەگەر بمانەوێت گفتوگۆ و دیبەتەکان و وەڵامدانەوەکان بەرهەمدار و

قەناعەت پێکەر بن پێویستە کەسانی لێکۆڵەر و پسپۆڕ بەو کارە هەستن.

**١٦-** دامەزراندنی سەنتەر و دامەزراوەی زانستی تایبەت بە وەڵامدانەوەی ناباوەڕی و ڕەواندنەوەی گومانەکان. بەستنی کۆنگرەی نێوخۆیی و نێودەوڵەتی لە زۆربەی وڵاتەکان بۆ کۆکردنەوە و وەڵامدانەوەی ناباوەڕی و گومان و شوبهەکان. دەتوانرێت ساڵانە بێت یان چەند ساڵ جارێك بکرێت و وەڵامی قەناعەتپێکەر و زانستی و لۆجیکی بدرێتەوە، وەك چۆن ئێستا بۆ بابەتە فیقهییەکان چەندان کۆمەڵەی فقیهیمان هەیە (المجامع الفقهیة)، کە پێشهات و پرسیارەکان کۆدەکەنەوە و لە شوێنێکدا زانایانی تایبەتمەند بەم بوارانە کۆدەبنەوە، تاوتوێی بابەتەکان دەکەن و وەڵامیان دەدەنەوە و بڕیاریان لەسەر دەدەن.

**١٨-** هەبوون و پەیداکردنی پەیوەندیەکی بەردەوام و توندوتۆڵ لەنێوان ئەو کەسانەی لەو بوارەدا کار دەکەن، هەروەها ڕا گۆرینەوەی بەردەوام لەنێوانیاندا هەبێت. جا ئەگەر لەسەر ئاستی جیهانیش نەتوانرێت ئەم کارە بکرێت، ئەوا هەوڵبدرێت لەسەر ئاستی نێوخۆی هەر وڵاتێك ئەو کارە بکرێت.

**١٩-** هاندان و یارمەتیدان و پشتیوانیکردنی قوتابیانی خوێندنی باڵا بۆ لێکۆڵینەوە و توێژینەوەکردن لە بواری ناباوەڕی، بەتایبەت وەڵامدانەوە و ڕەواندنەوەی گومانەکان.

**٢٠-** بەدواداچوون و لێکۆڵینەوە و سەرژمێریکردنی مەیدانی بۆ زانین و ناسینی ئەو کەسانەی تووشی ئەم نەخۆشییە بوون -ناباوەڕی- و ڕێنموونیکردنیان و وەڵامدانەوەیان و ڕەواندنەوەی گومانەکانیان بە شێوازێکی حەکیمانە و لێزانانە و نەرمونیان و پشوودرێژانە.

**٢١-** دانانی هەندێك پەرتووکی زانستی و بەهێز کە لەم بوارەدا نووسرابن لە قوتابخانە و زانکۆکان و سەنتەر و ڕێکخراوەکان، کردنیان بە مەنهەجی خوێندن و تێکەڵکردنیان و دانانیان لەگەڵ زانستە شەرعییەکان، واتا وەك وانەیەك لە وانەکانی زانستی شەرعی بخوێندرێت و گرنگی پێبدرێت.

**٢٢-** نووسین و وەرگێڕانی پەرتووکی بەهێز لەم بوارەدا، وەك پەرتووکی فیکری و فەلسەفی و زانستی و... هتد.

**٢٣-** گرنگیدانی تایبەت بە دروستکردنی کەسانی پسپۆڕ لە بواری ناباوەڕیدا، وەك چۆن هەوڵ هەیە بۆ پێگەیاندن و دروستکردنی بانگخواز و زانای ئایینی ئاواش هەوڵی دروستکردنی ئەم جۆرە کەسانە بدرێت کە تایبەتمەند بن لەم بوارەدا.

**٢٤-** سەردانیکردنی قاوەخانە و گازینۆ و ئەو شوێنانەی کە گەنجانی لێن، هەروەها پێشکەشکردنی موحازەرە و دەرگە واڵاکردن بۆ پرسیارکردن و وەڵامدانەوەیان بە شێوازێکی جوان و زانستی و قەناعەتپێکەر.

٢٥- هەستانی سەرکردەکان و سیاسییەکان و حاکمەکان بە ئەرك و واجبەکانیان بەرانبەر نەخۆشی ناباوەڕی.

٢٦- پەروەردەکرنی منداڵان و ڕۆڵەکان لە لایەن دایك و باوکانەوە، هەروەها کەمتەرخەمی نەکردنیان بەرانبەر ڕۆڵەکانیان، چونکە منداڵ و گەنج ئەگەر لەماڵەوە لە لایەن دایك و باوکییەوە پەروەردە نەکرێت و دانەمەزرێت لە ڕووی ئیمانی و فیکری و ڕەوشتییەوە، ئەوە بە دڵنیاییەوە لە دەرەوە و لە ڕاگەیاندن و لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و قوتابخانە و زانکۆکاندا پەروەردەیەکی خراپ و فیکرێکی خراپ وەردەگرن لە هەندێك حاڵەتدا.

٢٧- هەستانی مامۆستاکانی قوتابخانە و زانکۆکان و نێوەندەکانی خوێندن بە ئەرکی دینی و ڕەوشتی خۆیان و پەروەردەکردن و پێگەیاندنی قوتابیان بە پەروەردەیەکی ئیمانی و فیکری بەهێز، بە شێوەیەك بەرگرییەکی وا بۆ قوتابیەکان دروست بکات کە بتوانن خۆیان بپارێزن لە ڕووخانی فیکری و ڕەوشتی و ئیمانی.

٢٨- بەکارهێنانی شێوازی جیاواز بۆ هۆشیارکردنەوەی تاك و خێزان و کۆمەڵگە لە زەرەر و زیان و مەترسییەکانی ناباوەڕی، وەك بەرنامەی تەلەفزیۆنی و نووسین و پۆستی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و... هتد.

٢٩- نزیکبوونەوەی زانـــایان و بیرمـــەندان و بانگخـــوازان و پەروەردەکاران لەگەڵ گەنجان و تێکەڵبوونیان لەگەڵ ژیان و ئاگا

لێبوونیان بە شێوازێکی کردەیی و گوێگرتن بۆیان و وەڵامدانەوە و ڕەواندنەوەی گومانەکانیان.

**٣٠-** گرنگیدان بە نوێکاری لە شێواز و ئامڕازەکانی بانگەواز

**٣١-** هاندانی گەنجان لەسەر خوێندنی زانستی شەرعی و خۆشەویستکردنی لایان

**٣٢-** هاندان و هۆشیارکردنەوەی گەنجان لەسەر هاوڕێیەتیی هاوڕێی باش و بیر و فیکر سەلامەت، بەتایبەت بۆ کەسانێك کە بەرگری و بەرگری فیکرییان نییە و ناتوانن وەڵامبدەنەوە، بەتایبەت لە بەشە نێوخۆیی زانکۆ و پەیمانگاکان، بەڵام ئەگەر ئەم کەسە بەرگری فیکری باشی هەبوو، کێشە نییە لەگەڵ ئەم جۆرە کەسانە تێکەڵ ببێت، بەڵکوو زۆر جار ڕەنگە لە سەریشی پێویست بێت بۆ ئەوەی وەڵامیان بداتەوە و ڕێنموونیان بکات و هیدایەتیان بدات.

**٣٣-** دروستکردنی سایت و پەیج و... هتد، تایبەت بە وەڵامدانەوەی ئیلحاد و گومان و شوبهە، بۆئەوەی ئەو کەسانەی کە گومانیان هەیە یان بۆیان دروستدەکرێت، بەزووترین کات دەستیان پێی بگات و وەڵامی قەناعەتپێکەر وەرگرن.

**٣٤-** دانانی بەرنامەی مۆبایل (ئەپڵیکەیشن)ی تایبەت بە وەڵامدانەوە و ڕەواندنەوەی گومانەکان، کە بەشێوەی پێڕست (فەهرەست) ڕێکخرابێت و گومانەکانی بەپێی بابەتە جیاوازەکان جیاکرابنەوە، بۆ نموونە گومانەکان لەسەر بوونی خودای گەورە

یان قورئان، یان لەسەر پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) یان... هتد.

٣٥- نوێکردنەوەی فیکری ئیسلامی بە شێوازێك کە لەگەڵ داواکارییەکانی مرۆڤ و مرۆڤایەتی و سەردەمی نوێ و داواکاری کۆمەڵگە و چینە جیاوازەکان بگونجێت، بەبێ لادان و تەنازولکردن لە بنەما عەقیدەیی و ڕەوشتی و تەشریعییەکان.

٣٦- بەهێزکردنی پەیوەندی لەنێوان زانستە ئیسلامییەکان و زانستە مرۆڤایەتییەکان و کۆمەڵایەتییەکان وەك: دەروونناسی و کۆمەڵناسی... هتد

٣٧- چارەسەرکردنی کێشە و خەلەل و گرفتی مەنهەجی لە مامەڵەکردن لەگەڵ دەق و واقیع، واتا چۆن بتوانین دەق دابەزێنین بۆ سەر واقیعە جیاوازەکان، دیارە ئەمە کارێکی قورسە و کاری زۆر باشی دەوێت، باشترین ڕێگەش بۆ ئەمە، ڕەچاوکردنی مەبەستەکانی شەریعەتە (مقاصد الشريعة).

٣٨- پلەبەندی لە ئەولەویاتی فیکری و سیاسی و بانگەوازی

٣٩- کردنەوەی دەرگای گفتوگۆ و ڕەخنەی مەنهەجی، سنگ فرەوانی بەرانبەری و دژایەتی نەکردنی

٤٠- ڕێگری لە تەوژمی تەکفیری و ڕووبەڕووبوونەوەی بیری توندڕەوی و ئیرهاب، یان بیری شلگیری و تەوژمی نەهێشتن و

ڕووخاندنی بنەما فیکری و عەقیدەیی و ڕەوشتی و تەشریعییەکانی ئیسلام. تەتەڕووف هەر توندڕەوی نییە، بەڵکوو تەتەڕووف واتە تەڕەفگیری و لایەنگیری، واتا لایەنێك بگری، جا بە لای توندڕەوی یان بە لای شلگیریدا بێت، کە هەر دووکیان دژی مەنهەجی ڕاستی ئیسلامن. مەنهەجی ڕاستی نێوەندگیرییە نەك تەڕەفگیری.

**٤١-** یەکخستنی تواناکان و کەفائەتەکان و چالاککردنیان لە هەموو بوارەکانی سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابووری، زانستی، بۆ دروستکردنی ئوممەتێکی یەکگرتوو کە فەرمان بکات بە چاکە و ڕێگری بکات لە خراپە.

**٤٢-** پێشکەشکردنی نموونە و قودوەی چاك لە هەموو بوارەکانی سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابووری، زانستی، فیکری... هتد.

**٤٣-** گرنگیدان بە ئەدەب و شیعر و پەخشانی ئامانجدار بەتایبەت ڕۆمان چ بە نووسین، چ بە وەرگێڕان.

**٤٤-** ئاگاداری و هۆشیاری لە فێڵ و تەڵەکە و بەهەڵەدابردنی لۆژیکی (المغالطات المنطقية)، چەواشەکاری.



## ئامڕازەکانی بڵاوکردنەوەی ئیلحاد



١- ڕەنگڕێژی و بۆیاخ کردنی ڕووی سەرجەم زانستەکان بە ڕەنگی ئیلحاد، بە شێوەیەك کە خەڵکانێك زانست بە پشتی ئیلحاد بە کۆمەڵگەکان دەفرۆشن و هەوڵ دەدەن ئەوە بکەنە زیهنی مرۆڤەکانەوە کە لە دەرەوەی ناباوەڕیش ئەفسانە ئایینەکان هەیە، ئەمەش ڕێگای لەبارە بۆ ڕەواجدان بۆ نەخشەڕێگای ناباوەڕی لە هەموو جیهاندا بەگشتی و وڵاتەکانی جیهانی سێهەم بەتایبەتی.

نموونەی برەودان بە زانست و دەرکردنی لە ئاستی خۆی لەنێو بیردۆزە زانستییەکاندا زۆرە و لە هەرە بەناوبانگەکەشیان بیردۆزی پەرەسەندنە کە ئایین و خوداباوەڕی لە خەڵکێکی زۆر لە تەواوی جیهاندا سەندەوە، کە لەڕاستیدا خاوەنی بیرۆکەی پەرەسەندن خۆی کەسێکی ناباوەڕ نەبووە.

٢- یەکێکی دیکە لە ئامڕاز و هۆکارەکانیان بریتییە لە فەلسەفە بە قوتابخانە جیاوازەکانەوە، دیارە فەلسەفە بۆ خۆی ئیلحاد و ئیمان ناناسێت وەکوو زانست، بەڵکوو ئەوە هەڵگری فەلسەفەیە کە دەتوانێت بەرگی ناباوەڕی بکات بەبەری هەر بیروبۆچوون و ئایدیاك کە خۆی پێخۆش بێت، بەڵام بەشێك لە فەلسەفەزانان بە نەسەقی ئیلحاد هەڵدەپەڕن و وای پیشاندەدەن کە فەلسەفە بێباوەڕە و ناتوانێت باوەڕ بە خودا بهێنێت، بۆیە دەبینین چەندان

قوتابخانەی فەلسەفەیان بەکارهێناوە بۆ ئەم مەبەستە، بۆ نموونە: قوتابخانەی مارکسیزم و پراگماتیزم و بوونگەرایی، کە فەلەسەفەیان خزاندۆتە نێو ڕووکاری سیاسی و کۆمەڵایەتی و سێکسی، ئەمەش خزمەت و ڕەواجدانە بەو پێشگریمانەیەی کە فەیلەسووفان پێش فەلسەفەکەیان هەیان بووە، ئەویش فکرە تایبەتییە ناباوەڕەکەیە.

٣- بەکارهێنانی نێوەندەکانی خوێندن (قوتابخانە و کۆلێژ و زانکۆکان).

٤- داگیرکاری سەربازی بە ناوی ئاوەدانکردنەوەوە، دیارە شتێکی زانراو و حاشا هەڵنەگرە کە عەلمانییەت وەك سەرچاوەیەك بۆ ناباوەڕی بەردەوام خەریکی داگیرکاری بووە، بەتایبەتیش لە وڵاتانی ئاییندار.

٥- بەکارهێنانی ئەدەبیش یەکێکە لە دیارترین و مەترسیدارترین ڕێگەکان بۆ ئیلحاد، بۆیە لە ڕێی پەرتووکە ئیلحادییەکان و شیعر و پەخشان و ڕۆمان هەوڵی خۆیان دەدەن، بەتایبەت ڕۆمان، بووە بە ئامڕازێکی زۆر بەهێز بۆ بڵاوکردنەوەی ئیلحاد و بەدڕەوشتی و بەڕەڵایی و لادانی فیکری و ڕەوشتی، بۆ نموونە: ڕۆمانی «حەمەدۆکی» یەشار کەمال، جگە لەوەی دوو کەسایەتی ئایینی هەڵبژاردووە بۆ نووسینەکەی کە موحەممەد و خەدیجەیە، ئەو دوو کەسەشی وەك دوو کەسی داوێن پیس ناساندووە! پڕیشی کردووە لەبیرۆکەی ئیلحادی و ئیباحی.

٦- یەكێك لە پاڵنەرە بڕسكبڕەكانی ئیلحاد جیهانگیرییە (عولمة) (Globalization) كە ڕەنگە بوترێت سەرەكیترین ئامڕازی بڵاوكردنەوەی ناباوەڕییە لە جیهاندا، چونكە كارپێكەرانی جیهانگیری تا ئاستێكی مەترسیدار شارەزا و بوێر و چاونەترس و پارەبەدەست و بێویژدان و بێباك و دژ بە بەها مرۆڤایەتییەكانن، ئەوەی بیانەوێت دەیكەن، ئەوەی بیانەوێت پێیان دەكرێت.

ئەوان سیاسی نەشارەزا و بێئەزموون لە پلە و پۆستە بەرزەكاندا جێگیر دەكەن، دڵسۆزی گەل و خاك و كەلتور و ئایین ناچار بە سازش دەكەن بۆ قوتی ئاسایی خۆی، بەوەش بەشێكی كۆمەڵگە هەژار دەخەن و ماندووی دەكەن بە نانی ڕۆژانەی ژیان و دەرفەتی بیركردنەوە و تێفكرینیان لێدەسێننەوە، كە ڕەنگە ناچاری ناباوەڕییان بكەن.

بەشێك لەخەڵكیش سەرقاڵ دەكەن بە زۆری هەبوونی پارە و سەروەت و سامان و بیروباوەڕیان بیردەبەنەوە، خۆیان لەسەرەوە لێیان دەخوڕن و بەو شێوەیەی دەیانەوێت ئاڕاستەیان دەكەن، لە وڵاتە ئاییندارەكاندا قوتابخانە و زانكۆ و پەیمانگای سەر بە خودی خۆیان دەكەنەوە و بەشێكی كۆمەڵگە لە دەست دابونەریت و قەید و بەندی ئایینەكان دادەماڵن و بەشەكەی دیكەی كۆمەڵگەش ئاسانتر بەر تیر و شیری هەڵكێشراویان دەكەوێت. بەمەش توانیویانە كۆمەڵگەكان ڕامبكەن و بۆ هەر مۆڵگەیەكیان بوێت لێیان بخوڕن.

٧- میدیاش دەسکەلای دەستی ڕێچکە ئیلحادییەکە و هەموو بێباوەڕەکانە بۆ گەورەکردن و بەرەوپێشبردنی بیرۆکە ئیلحادییەکان بە سەرجەم سۆشیال میدیاکانیشەوە.

٨- کۆڕگرتن و سەنتەر دروستکردن، ئەمەش یەکێکی دیکەیە لە ئامڕازەکانیان لە ڕێی کۆڕ و پلاتفۆڕم و سەنتەر دامەزراندنەوە بیروڕاکانی خۆیان دەخەنە ڕوو و پەرەی پێدەدەن.

**٩.** دەستکاری کردن و گۆڕینی دەقەکان، دەستکاری و گۆڕینی دەقەکان دوو جۆرە، یان خودی دەقەکە دەستکاری دەکەن بە زیادکردن و کەمکردن، یان دەستکاری واتای دەقەکان دەکەن و بەلاڕێییان دەبەن، نموونە زۆر زۆرە بەڵام لەبەر درێژبوونەوە ناتوانین باسیان بکەین.

**١٠.** بڵاوکردنەوەی پەرتووکی ناباوەڕی یان زانستی و فەلسەفی و ئەدەبی کە پڕیانە لە بیروبۆچوونی ناباوەڕی و گومان و شوبهە.

**١١.** ناشیرینکردنی ئیسلام لەبەر چاوی خەڵك بە ڕێگەی جۆراوجۆر و هەڵبەستنی تۆمەتی بێبنەما.

**١٢.** ڕاکێشانی زانایانی ئایینی و ڕۆڵەکانیان، بۆ نموونە لە سەرەتادا کە شیوعییەت هاتە کوردستان، هەوڵیاندا کوڕە مەلا و شێخەکان بۆ لای خۆیان ڕابکێشن، کە تاڕاددەیەك سەرکەوتووبوون لەمەدا و توانیان کوڕە مەلا و کوڕە شێخێکی زۆر بکەنە شیوعی و مارکسی.

**١٣.** بڵاوكردنەوەی گومان و شوبهە و تۆمەتی بێبنەما بەنێو خەڵكدا دژ بە ئیسلام، بەتایبەت لەنێو گەنجاندا.

**١٤.** بەهەڵەدابردنی لۆجیكی (المغالطات المنطقیة)، زیاتر لە (٣٠) جۆری بەهەڵەبردنی لۆجیكیمان هەیە، كە زۆر جار بێباوەڕەكان بەكاری دێنن دژی ئیسلام و موسوڵمانان، بۆ نموونە یەكێك لە چەواشەكارییەكان بریتییە لە گشتاندنی شتێكی تایبەت (تعمیم أمر خاص)، بۆ نموونە دەڵێن: مێژووی ئیسلام هەمووی خوێن و وێرانكاری و شەڕ و كوشتارە.

**١٥.** زیندووكردنەوەی هەندێك لە ئایینە كۆنەكان، وەك (زەردەشتی).

**١٦.** داهێنانی هەندێك ئایینی نوێ و جیاكردنەوەیان لە ئیسلام و گرنگی پێدانیان، بۆ نموونە داهێنان و یارمەتیدان و پشتگیری كردنی «قادیانی و بەهائی»، كە دیارە ئەم گرووپە باطینییانە بە تەواوی سەربەخۆ و جیاوازن لە ئیسلام، چونكە پێیان وایە پێغەمبەر و پەرتووك و وەحی تایبەت بە خۆیان هەیە و هەتاوەكوو لە عیبادات و لە موعامەلاتیشدا بەتەواوی لایانداوە، بۆ نموونە نوێژ كردن و حەج كردن و ڕۆژووگرتنی تایبەت بە خۆیان هەیە، زۆرێك لە حەرامەكانیان حەڵاڵ كردووە، وەك تلیاك و عەرەق و... هتد.



## زیان و شوێنەوارەکانی ناباوەڕی



دیارە ناباوەڕی و ئیلحاد کاریگەرییەکی زۆر نالەبار دەخاتە سەر سەرجەم کایەکانی ژیانی مرۆڤایەتی و دایاندەماڵێ لە زۆربەی هەرە زۆری بەها کۆمەڵایەتی و فکری و ڕەوشتییەکانی مرۆڤ کە ڕەنگە تەمەنێك بێت مرۆڤایەتی شانازییان پێوە بکات، بەوەش زۆر ئاسان ژیان لەو ئاستە سازگار و گونجاوە دێتە خوارەوە و مرۆڤەکان جیا لە ژیانێکی سادەی حەیوانی و ئالەتی زیاتر هیچیان بۆ نامێنێتەوە.

ئێمە لێرەدا لە هەندێك گۆشە نیگاوە سەیری بابەتەکە دەکەین و زیانەکان دەستنیشان دەکەین:

### ١- لەڕووی فیکری و ئەقڵییەوە:

ئیلحاد جێدەستی نێگەتیڤی خۆی زۆر ئاسان لەسەر فیکر و ئەقڵ جێدەهێڵێت، چونکە ئیلحاد دژی هەموو پرەنسیپ و بنەما فیکری و ئەقڵی و لۆجیکییەکانە، تەنانەت دادەبەزێتە سەر ئاستێك کە گومان لە بەڵگە نەویستەکانیش (مسلمات عقلية)[١] بکات و

---

(١) ئەگەر سەرت بهێشێت و بڕۆیت دەرمانێك وەربگریت و پرسیار بکەیت ئایە ئەم دەرمانە تۆ بڵێیت کەسێك دروستی کردبێت و کارگەیەك بۆ دروستکردنی ئەو دەرمانە بوونی هەبێت پرسیارێکی ڕەوایە؟ ئەگەر کەسێکی

لە عەقڵی خۆشیان دوودڵ دەبن و یەکێك لەو بەڵگەنەویستانە کە ئەوان ڕەتی دەدەنەوە کە بنەمای یەکەمی بەڵگەی کەلامییە و دەڵێت: ((هەموو دروستکراوێك دروستکارێکی هەیە))، بەڵام دەبینین بەشێك لە ناباوەڕان باوەڕیان پێ نییە و دژی دەوەستنەوە بەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکی ئەقڵی و زانستی و لۆجیکی بخەنەڕوو.

یان یاسـای ڕێکخستن و سیسـتەم کە دەڵێت: ((هـەموو ڕێکخراوێك ڕێکخەرێکی هەیە))، بەڵام دووبارە دەبینین ناباوەڕی بەبێ هیچ یاسا و بەڵگەیەك دژیەتی، ناباوەڕی کاری بەس ئینکاریکردن و نکوولیکردنە، واتە بەس دەتوانێ ئینکاری لە ڕاستییەکان بکات لە نێویشیاندا ئینکاری هەبوونی خودا بکات، بەڵام ناتوانێت بەڵگەی لەسەر بێنێتەوە، وەك کەسێك دەتوانێ

---

هۆشیار و ئاقڵ بیت، بێگومان نا! چونکە خۆ دەرمانی چارەسەر دەبێت کەسێکی شارەزای بوارەکە بەپێی پێویست کەرەستەی لەبەردەمدا بێت و کەرەستەکان تێکەڵاو بکات بە چەندێتی و چۆنێتی پێویست، بەباشی ئاگای لێیان بێت و کاتێکی دیاریکراو بیهێڵێتەوە، پاشان بە شێوەیەکی ستاندارد لەنێو کارگەیەکدا ئەو حەپ و دەرمانانە بخرێنە نێو پارچەی حەپی گونجاو کە بە قیاسی حەپەکە دروستکراوە و دەیپارێزێت لە شێ و تەڕی و وشکبونەوە و کاریگەرییە دەرەکییەکانی دیکەی ژینگە. لە سەروو ئەوەشەوە لەسەر بەرگی دەرمانەکە زانیاری پێویستی بەکارهێنان و ناوی دەرمان و ئەو زیانانەش باس دەکات کە لە ئەنجامی خواردنی دەرمانەکەوە ڕوودەدات. دیارە کەسی ئاقڵ و هۆشمەند هەرگیز ناپرسێت ئاخۆ ئەو حەپە لە خۆوە دروست بووە، دەی ناباوەڕی گومان لە بەڵگەنەویستەکانی عەقڵ دەکات.

ئینکاری ئەوە بکات کە ئاگر سووتێنەرە، بەڵام هەرگیز ناتوانێ بەڵگەی لەسەر بێنێتەوە.

### ٢- لەڕووی ڕووحی و دەروونییەوە:

کەس ناتوانێت نکۆڵی لە گرنگی باوەڕ و ئایینداری بکات لەسەر دڵ و دەروون، ئەوەش زانست پشتی دەگرێت و ڕوونی دەکاتەوە، تەنانەت لە هەندێك لێکۆڵینەوەدا جینی ئایینداری دۆزراوەتەوە لەنێو مێشکی مرۆڤدا کە دواتر باشتر ڕوونی دەکەینەوە.

ئەو بۆشاییەش کە ناباوەڕی دروستی دەکات ئاسان پڕنابێتەوە و تەنانەت ناباوەڕان خودی خۆشیان هەوڵیانداوە مەراسیمە ئایینییەکان بەبێ ئایین جێبەجێ بکەن و ئەو بۆشاییە پڕبکەنەوە کە لە دووری ئایین و خودادا دروست بووە.

### ٣- لە ڕووی ڕەوشت و بەهاکانەوە:

کە ئەقڵ و فیکر و ڕووح و ناخ و دڵ و دەروون تێکچوون، ڕاستەوخۆ ڕەنگدانەوەی دەبێت بەسەر خوڕەوشت و ڕەوشت و هیچ شتێ نامێنێ بە ناوی ڕەوشتەوە و سنوورەکان هەموو تێکدەشکێن و بەهاکان هەموو پێشێل دەکرێن، چاك و خراپ و خێر و شەڕ و بەها مانایەکی نامێنێت و بوونیان لە دەست دەدەن، بۆیە هەموو فەیلەسووفەکان بە بێباوەڕەکانیشەوە کۆکن لەسەر ئەوەی کە پەیوەندییەکی زۆر بەهێز هەیە لەنێوان خودا و ئایین و ڕەوشتدا.

ڕەنگە گەورەترین زەرەرمەند ڕەوشت بێت کە لە سایەی ئیلحادەوە مرۆڤایەتی تووشی دەبێت، چونکە هەموو ئەو شتانەی بە درێژایی مێژوو بەها و ڕەوشتی کۆمەڵگەکان بوو ناباوەڕی دەیەوێت لێیان بسێنێتەوە، لە تێرکردنی ئارەزوو بەرانبەر کەسوکاری نزیك و خواردنی گۆشتی ناسکی منداڵ و هاوڕەگەزبازی و هەموو پرەنسیپێکی بەرزی مرۆیی دیکە کە مرۆڤ بە خەیاڵیدا دێت.

### ٤- لە ڕووی تاك و کۆمەڵگەوە:

هەر لەو جێیەی بەها لە مرۆڤ و مرۆڤایەتی سەندرایەوە بە فشاری ناباوەڕی و بگرەوبەردەی ئازادی، ئەوە تاك تێکدەچێت و بنەما کۆمەڵایەتییەکان هەڵدەوەشێنەوە، لە ڕیزی هەرە پێشەوەی بنەماکانیش دروستبوونی خێزان و پەروەردەیەکی تەندروستی کۆمەڵایەتی و خێزانییە.

بەڵام ناباوەڕی نرخ بۆ هیچ کایەیەك دانانێت و مرۆڤی ئاقڵ و سەلار و ساغ و تێکنەچوو هەر زوو هەست بە مەترسییەکانی دەکات، بۆ نموونە:

یەکێك لە بە بەهاترین هەبووی مرۆڤ دایکییەتی، کە ئەگەر ئایینیش لێگەڕێین ئەوە کەلتور و قیەمەکان ڕێگەی هیچ جۆرە سووکایەتییەك نادەن بەرانبەری، بەڵام بەداخەوە ئەو نیشتیمانە گەورەی مرۆڤ، (دایك) لە چاوی ئیلحاددا لە نەمانی قیەم و ڕەوشتدا وەك کاڵایەك سەیری دەکات و دەکرێت بوکەڵەیەکی

خۆش لە دەستهاتوو بێت بۆ پڕکردنەوەی ئارەزووی جنسی نێرینەکانی نێو ماڵ، لەکاتێکدا ئەو دایکە گەورەی کردوون و لە باوەشی گرتوون. نموونەکان لە دنیای مۆدێرنەی کۆمەڵگە ڕۆژئاواییەکاندا زۆر و زەبەندەن و خەریکە پڕیشکی ئاگرەکە ئێمەش دەگرێتەوە.

دەی ئەو حاڵە ناتەندروستە بەراورد بکەن بە ئیسلام کە بۆت نییە پێی بڵێیت: ئۆف!!!

### ٥- لە ڕووی سیاسی و حوکمڕانییەوە:

بەپێی لێکۆڵینەوەکان لە کاتی دەسەڵاتە ناباوەڕییەکاندا خراپترین نموونەی فەرمانڕەوایی پیشاندراوە، چونکە هەر ئەو خەڵکەیە سیاسەت و حوکم و دەوڵەت دروستدەکات و دەیبات بەڕێوە کە بەها ڕەوشتی و فکری و کۆمەڵایەتییەکەی لەدەستدا بوو لە پێشتردا، لەم کاتەدا ستەم و زۆرداری سیاسی دێتە کایەوە. ئەوەی بینیمان لە ڕووسیا و چین، یان ئەوەی ئێستا دەیبینین لەکۆریای باکوور. بۆیەش ئەدیبێکی ناوداری ڕووسی بە ناوی (ألکسندر سولجنستین) دەڵێت: لە ماوەی حوکمی بەلشەفیدا (٥٥) ملیۆن کەس لە یەکێتی سۆڤیەت لەنێوچوون کە لە سەردەمی «لینین»دا دەستی پێکرد و تەنها لە پەلاماری پاککردنەوەدا لەماوەی ساڵانی (١٩٣٦-١٩٣٩)دا، لەماوەی (٣) ساڵدا (١٠,٨) ملیۆن کەس لە یەکێتی سۆڤیەت قەلاچۆکران، هەر لەبەرئەوەی دەیانگوت:

«دژی فیکری مارکسیزم و لینینین». ئینجا «لینین» بانگەشەکردن دژی فیکری شیوعی و ناباوەڕی بە گەورەترین تاوان دانابوو کە کەسەکەی لەسەر ئیعدام دەکرا.

لە چین، لە ماوەی حوکمی «ماوتسی تۆنگ» (٤٠) ملیۆن کەس کوژران، خەڵکی زۆرتریش لەو ژمارەیە کوژراوە لەژێر دەسەڵاتی بێباوەڕان.

### چاو خشانێکی خێرا بە مێژووی خوێناوی ئیلحاددا:

١- ٢٠ ملیۆن کوژراو لە یەکێتی سوڤیەت

٢- ٦٥ ملیۆن لە چین

٣- ٢ ملیۆن لە کۆریای باکوور

٤- ١ ملیۆن لە دەوڵەتە شیوعییەکان، لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات

٥- ٢ ملیۆن لە کەمبۆدیا

٦- ١ ملیۆن لە ڤێتنام

٧- ١٥٠ هەزار لە ئەمریکای لاتینی

٨- ١,٥ ملیۆن لە ئەفغانستان

٩- ١,٧ لە ئەفریقیا[١]

---

(١) - سەرچاوە: (الكتاب الأسود للشيوعيه).

### ٦- لە ڕووی ئابووری و گوزەرانەوە:

دیارە ناباوەڕییێکی داماڵراو لە بەها و دادپەروەری لێی چاوەڕێ ناکرێت ژیانی خەڵك باش بکات و ئابوورییەکی دادپەروەرانەی هەبێت بۆ مرۆڤەکان، چونکە لە سایەی ئیلحاددا قڕی و پڕی و چینایەتی و خۆپەرستی و یاسای قێزەونی سەرمایەداری: «هی خۆم بۆ خۆم، هی تۆش دەخۆم.» دێتە ئاراوە، وەك ئەوەی ئێستا دەیبینین لە جیهانی سەرمایەداریدا، کە (٥٪)ی داهاتی جیهان هی (٩٥٪)ی خەڵکە و (٩٥٪)ی داهاتی جیهان هی (٥٪)ی خەڵکە، بەتایبەت لە جیهانی سەرمایەداریدا.



## سروشتی کەسانی ناباوەڕ



بەشێوەیەکی گشتی چەند سیفەتێك هەیە کە بێباوەڕەکان بەیەکەوە دەبەستێتەوە و خاڵی هاوبەشە لەنێوانیاندا، ئەوەش بە گفتوگۆکردن لە گەڵیان و بە مامەڵە و گفتار و ڕەفتاریان و تەنانەت بە سەیرکردنی پەیج و ئەکاونت و سایتەکانیشیان دەردەکەوێت:

١- ئەتاییستەکان بە زۆری خەڵکانی جددی نین، بەڵکوو کارەکانیان ئیهمال و ساردوسڕە، بەوەش هەمیشە دەم بە گاڵتەوگەپ و قسەی بێسەروبەرن بەرانبەر بە خەڵکی و بە ئایین و باوەڕیش، ناتوانن لێکۆڵینەوە بکەن و لەو بەرنامە و ڕێبازەی لەسەرین، بەڵکوو هەر بە کەچە زانستێکی سادە و کۆڵەوار ئیکتیفا دەکەن و دەستهەڵدەگرن، ئەوەش وادەکات هەموو کات ئەوان لە ڕووبەڕووبوونەوە و دانیشتن و دیبەیت خۆیان بپارێزن ئەگەر بەرە و لای کەسانی شارەزا ئاڕاستەکران، ئەگەریش زانیان بەرانبەرەکانیان دەستوپێ سپی و کەم زانستن دەنگیان دلێر دەکەن و زانست دەکەن بەکاڵای باڵای پوکاوی ناباوەڕی و بە چواردەوریان دەفرۆشنەوە.

٢- بانگەشەی ئازادی بیروڕا و ئەقڵانییەت و دوورکەوتنەوە لە ئەفسانە (واتا: ئایین) دەکەن، لە کاتێکدا بۆ خۆیان بڕوایان بە ئازادی نییە و بنەماکانیشیان هەرگیز لەگەڵ ئەقڵ و فیکر و فیترەت

و زانست نایەتەوە و شتانێکیان لێوە دەبیستی کە هەرگیز لەگەڵ واقیع و ڕاستییەکاندا ڕێك ناکەوێت.

لە پێناو بەدیهێنانی ئامانجی ئیلحادی خۆیاندا هەوڵ دەدەن ئازادییەکان لە بەرگی زانست و دیموکراسی و ڕۆژگاری تازەدا بە خەڵکی بفرۆشنەوە، لەسەر بنەمای ناساندنی بیرە ئایینییەکان بە ئەفسانە و لێدان لە کەسایەتییە بەرزەکانی نێو ئایینەکان بە تایبەتیش ئایینی ئیسلام، تاوەکوو بە ڕێگایەکی تەخت و ئاسانتر بتوانن بگەنە ئەو مەبەستەی خۆیان دەیانەوێت کە ئازادی بە شێوازی بەرەڵڵایی و شوێنکەوتنی ئیلحاد و نەهێشتن و سووککردنی سەنگی قورسی ئایین و کەسایەتییە ئایینەکانە لەنێو خەڵکیدا.

**٣-** هەموو ئەو ئامانجانەی ناباوەڕ باسکران لە سەرەوە، ڕەنگە کاری سەرەکییان بێت بۆ دەستخستنی ئامانجی یەکەمیان و سەرەتاییان کە تێرکردنی ئارەزوو و خواستە ئاژەڵییەکانیانە.

لە ڕاستیدا دەبێت ئاماژە بۆ ئەوە بکرێت کە هەموو مرۆڤەکان بەگشتی خاوەنی پاڵنەری خوو و خوڵقەت و ئارەزوو و حەزی ئاژەڵین، ئەوە بەس بێباوەڕەکان نین کە حەزە ئاژەڵییەکان پاڵیان پێوە دەنێت و شەیتان لە ژێر کەڵکەڵەیاندا دەخوێنێت، بەڵکوو ئاییندارترین و بەڕەوشترین مرۆڤیش هەمان ئەو پاڵنەرانەیان هەیە، بەڵام هەموو جیاوازییەکە ئەوەیە کە ناباوەڕان و بێباوەڕان خۆیان

لە هەرچی پرەنسیپ و ڕەوشت هەیە دزیوەتەوە و لە دوورەوە حاشای لێدەکەن، ئەمەش بۆ ئەوەی ئاسانتر و ڕەواتر دەستیان بە ئارەزووەکانیان ڕابگات، بەڵام خوداباوەڕان (باوەڕداران) و ئاینداران بە قەید و بەندێکی توند و جڵەوگیری باوەڕداری لە کردەوە ئاژەڵی و دڕەندەییە دزێوەکان سڵەمێنراونەتەوە، بەجۆرێك باوەڕداری ڕاستەقینە و شوێنکەوتەی سەرڕاستی ئایینی نەك کردەوە ناشیرینەکان ئەنجامنادات، بەڵکوو هەر ڕووی نایەت لە لای خەڵکی باسیشیان بکات. هەر لەوێشەوە جیاوازی باوەڕ و ناباوەڕ دەست پێدەکات و ئیعلانی ناباوەڕی خۆی دەکات.

٤- زیاتر بێباوەڕان لە بەرەی نکۆڵیدان و تەنها ئینکاری دەکەن بە ناوی زانستی و ئەقڵانی و لۆجیك، ناشتوانن بەڵگەی ئەقڵی و زانستی و لۆجیکی بۆ پشتیوانیکردن لە بۆچوونەکانیان بدەن بە دەستەوە، بۆ ئەو مەبەستەش بە زمانێکی هەڵخەڵەتێنەر دەستدەکەن بە وشەسازی و چەند دەستەواژەیەکی ئینگلیزی و زانستی و فەلسەفی باس دەکەن لەگەڵ ناوی هەندێك لە زانا و فەیلەسووفان، تا بەشکم نێچیرێك لە چواردەورە خەڵەفاوە نەزانەکە پێیان سەرسام و تەسلیم بێت.

٥- بێباوەڕان خاوەنی ڕەوشتنامە نین وەك ئاینداران و هیچ شتێك پێیان ناڵێت و فێریان ناکات کە فڵانە شت خراپە و فڵانەش باشە، جا ئەگەر قەبووڵیان بێت و نەبێت، ئەوان بێڕەوشت و ڕەوشت نامەن، بۆیە ئاساییانە دژی هەموو عادەت و عورفی کۆمەڵگەن،

-ئەگەر باشیش بێت- بانگەشەکردن بۆ دابڕان لە هەموو عادەت و عورفێك بە ناوی کرانەوە و پێشکەوتن، چونکە ئەو ئاداب و کەلتور و یاسایانە لەمپەرێکی بەردینی بەهێزن لە بەرانبەر دەستەمۆکردنی کۆمەڵگە و هەڵنانیان بەرەو ئەو کرانەوە ڕەها و نانەجیبەی ئەوان داوای دەکەن

٦- بەشێوەیەکی گشتی ئەوان دابڕاون لە کۆمەڵگەکان، بە تایبەتیش کۆمەڵگە ڕۆژهەڵاتییەکان. بۆیە بۆ پڕکردنەوەی پەراوێزخران و لانی کەم یەکسان بوونیان لەگەڵ تاکەکانی کۆمەڵگە خۆیان بە شتێکی دیکە و گەورەتر لە چواردەوریان پیشان دەدەن، ئەمەش لە ئەنجامی ڕووخانی دەروون و تووشبوونی بەشێکیان بە خەمۆکی و نەخۆشییە دەروونییەکانی دیکە.

ڕەنگە وا بخوێنرێتەوە لێیان کە پێیان وایە ئەو خەڵکە هەمووی گێلە و بە دوای کڵاوی بابردوو کەوتووە و کەوتوونەتە نێو خوڕافییات و سەرهێشەی کۆنی ئایینەکانەوە.

## تایبەتمەندی کەسانی ناباوەڕی توندڕەو

هەرچی خاسیەتە دەروونی و کەسییەکانی بێباوەڕە توندەکانە، بەڕوونی لە ژیاننامەکانیان و ئەو نووسینانەدا دەرکەوتووە کە لەبارەیانەوە نووسراوە، ئەو کەسانەی باوەڕیان بەوە هەیە کە بێباوەڕی توندڕەو و شپرزەیی کەسایەتی پەیوەندیان پێکەوە هەیە و کۆیان کردوونەتەوە، دەکرێت لەم خاسیەتانەی خوارەوە کورتیان بکەینەوە:

١- هەستکردن بە دڵەڕاوکێ و تووڕەیی و بێزاری

٢- زوو بێهیوابوون

٣- خێرایی لە کاردانەوەدا، لەگەڵ خەمۆکی، ڕووگرژی، ڕەشبینی

٤- هەستکردن بە بەتاڵی و بۆشایی و بێواتایی

٥- ڕەتکردنەوە و ئارەزووکردنی دەمەتەقێ و ململانێ و کەللەڕەقی و نەگونجان

٦- بێزاربوون و گۆشەگیری و نائارامی، بێتوانایی لە دروستکردنی پەیوەندی نوێ یان پارێزگاریکردن لە پەیوەندییەکانی پێشوو تەنانەت لەگەڵ خوشك و براکانیشیاندا

٧- هەست نەکردن بە ئارامی (هەستیاری لە ڕادەبەدەر بۆ ڕەخنە و هەڵسەنگاندنی نەرێنی)

٨- متمانە بەخۆ نەبوون و شاردنەوەی ئەو هەستە بە ڕەفتاری خۆ بەزلزانی و هەڵەشەیی و نیشاندانی گەورەیی. هەروەها بە کەم سەیرکردنی هەر کەسێك کە خۆی لێ دوور بگرێت یان بیوروژێنێت.

٩- بیرکردنەوەی شپرزە و بەکارهێنانی دەستەواژەی بریقەدار لە شوێنی نەشیاودا و پەیوەندی لەگەڵ کەسانی دیکەدا بە سەرکێشی و وروژاندن و ڕەفتاری سەرنج ڕاکێش

**١٠-** زۆر سەرقاڵبوونی لە ڕادەبەدەر بە سێکس، هەوڵدان بۆ بەدیهێنانی چێژ و زیادەڕەویکردن لە خواردنەوەی مەی و ماددە بێهۆشکەرەکان، ئارەزووکردنی هەژموون و خۆشویستنی دەسەڵات و هەر شتێکیش کە یارمەتی بدات لە واقیع ڕابکات

**١١-** ڕق و کینە و بە کەم زانینی ئەو کەسایەتی و پێگانەی کۆمەڵگە ڕێزیان لێدەگرێت

**١٢-** نەبوونی توانای مامەڵەکردن لەگەڵ بیرۆکەی مردن و خۆ لادان لە بیرکردنەوە لە مردن

مامۆستای بیرکاری «جیفری لانگ» (Jeffery Lang)ی ئەمریکی دۆخی دەروونی بێباوەڕ وەسف دەکات بەو جۆرەی خۆی لە کاتی بێباوەڕبوونیدا تێیدا ژیاوە و وەك گوزارشتێك لە سروشتی پەیوەندییەکانی و کاردانەوەکانی و ئاڕاستە فیکری و بێباوەڕی و کۆمەڵایەتییەکانی، وەك شیکارێك بۆ سایکۆلۆجییەتی دوورەپەرێز و گۆشەگیر و لاوازی کەسی بێباوەڕ، دەڵێت: «زۆر زوو تێگەیشتم کە هیچ کەسێکی باوەڕدار هەست بە تەنهایی ناکات، چونکە کەسی باوەڕدار کاتێك هەست بە تەنیایی دەکات لە خودا دەپاڕێتەوە، لە ناخی دڵییەوە لەگەڵ خودای تاقانەی دەدوێت، توانای ئەوەشی هەیە هەست بە وەڵام بکات، بەڵام کەسی بێباوەڕ لەم نیعمەتە بێبەشە، چونکە پێویستە ئەو پاڵنەرە وردوخاش بکات و هەمیشە بیری خۆی بخاتەوە کە شتێکی بێمانایە. کەسی بێباوەڕ خۆی خودای جیهانە تایبەتییەکەیەتی، کە جیهانێکی زۆر بچووکە،

بواری هەستەکانی سنووداری دەکەن و ئەو سنوورانەش هەمیشە لەگەڵ یەکتردا دژیەکن، هەروەها هیچ شتێك پێداویستییەکانی کەسی بێباوەڕ پڕ ناکاتەوە، چونکە بیروباوەڕەکەی پێی دەڵێت کە ژیان هیچ ئامانجێکی نییە، هیچ شتێکی تەواو یان ڕەها بوونی نییە. لەبەرئەوە کاتێك شوێنی بەها کۆمەڵایەتییە باوەکان دەکەوتم، تەنها لەبەرئەوە بوو کە ڕێزم دەگرتن و پێم وابوو ڕەوڕەوەی ژیان دەجووڵێنن.»

گومان لەوەدا نییە کە هەمیشە لە ناخی مرۆڤدا پێویستییەکی فیتری هەیە بۆ تێپەڕاندنی ڕەهەندە ماددییەکانی و چوونە پاڵ هێزێکی گەورەی ئەودیو سروشت، ئەو هێزەی ئیلهامی پێدەبەخشێت و بەهێزی دەکات و بەرەو ڕاستی ڕێنموونی دەکات و وای لێدەکات هەست بە ئارامی و ئاسوودەیی بکات، ئەگەر کەسی دیندار باوەڕی بە شتانێك هەبێت کە لە سەرەوەی هەستەکانییەوەن، ئەوا کەسی بێباوەڕ ناتوانێت باوەڕ بەو شتانە بکات، کەچی هیچ شتێکی ڕاستەقینەی نییە، تەنانەت خودی حەقیقەتیش.

زۆربەی کات دەبینی کەسی بێباوەڕ بە خۆیەوە سەرقاڵە، هەوڵدەدات پارێزگاری لە یەکێتی و هاوسەنگی خۆی بکات، بۆ ئەوەی واتایەکی بە بەردا بکات.

لە هەمان کاتیشدا، پێویستە دەستێوەردانی هێزە دەرەکییەکان قەبووڵ بکات، بەتایبەتی پەیوەندییە مرۆییەکان، کە دێنە نێو جیهانە تایبەتییەکەی، بێئەوەی بتوانێت پێشیان پێ بگرێت، چونکە کەسی

بێباوەڕ کاتێك پێویستی بە سادەیی و دوورەپەرێزی و تەنیایی هەیە، پێویستی بەوەش هەیە لەگەڵ کەسانی دیکەدا پەیوەندی ببەستێت.

لەوێوە کارەساتی کەسی ناباوەڕ دەگاتە لووتکە، کاتێك بیر لە مردن دەکاتەوە، لەو بارەیەوە «جیفری» دەڵێت: ئێمە هەموومان هەوڵ بۆ نەمری دەدەین»، کەسی باوەڕدار دەتوانێت خەیاڵی ڕێگای بەدیهێنانی نەمری بکات، بەڵام کەسی ناباوەڕ پێویستە بیر لە چارەسەری هەنوکەیی بکاتەوە، بۆ نموونە: لەڕێی داهێنانێك، یان قوربانیدان یان کارێکی پاڵەوانانە یان ڕۆمانسی، بۆ ئەوەی لە بیری خەڵکدا بمێنێتەوە، ئامانجی بەرزی کەسی بێباوەڕ چوونە بەهەشت نییە، بەڵکوو ئامانجی ئەوەیە لە بیری خەڵکدا بمێنێتەوە.»

### نەخۆشی کەسی ناباوەڕ (The Atheist Syndrome)[١]

بە پشت بەستن بە لیستی خاسیەتە کەسییەکانی بێباوەڕە توندڕەوەکان و بەوەی زۆرێك لە پزیشکە دەروونییەکان ناویان ناوە شپرزەیی کەسایەتی بێباوەڕی (Atheism personality Disorder)، ژمارەیەك لە پزیشکە دەروونییەکان وەك نەخۆشی (Syndrome) ی تەواو سەیری بێباوەڕی دەکەن.

---

(١) - بۆ زانیاری زیاتر لەو بارەیەوە تەماشای ئەم پەرتووکانە بکە: ئیلحاد گرفتێکی دەروونییە، عمرو شریف، و. موزەفەر عەوڵا قەسرێیَ، تەفسیر ٢٠١٩. لە دایك بوون بە باوەڕداری، جەستن باریت، و. ئاراس عیزەدین، ڕێنوێن ٢٠١٩. نفسية الالحاد، بول فيتز، دلائل، ١٤٣٨.

بیرمەند و نووسەری ئەمریکی «جۆن کۆستەر» john P. Koster)) لە پەرتووکەکەیدا جۆرێك لە نەخۆشی دەستنیشانکردووە و ناوی ناوە «نەخۆشی بێباوەڕ»[1] (Syndrome The Atheist).

کۆستەر بۆ لێکۆڵینەوە لە نەخۆشییەکە پشتی بە کۆمەڵێك توێژینەوەی دەروونی ژمارەیەك لە کۆمەڵگە بێباوەڕە هاوچەرخەکان بەستووە، گرنگترینیان چوار کەسن: چارلس داروین (Charles Darwin) و تۆماس هاکسلی (Thomas Huxley) و فریدریك نیچە (Frienrich nietzche) و سیگمۆند فرۆید (Sigmund Freud)، ئەمە جگە لە کۆمەڵێك کەسایەتی دیکەی وەك هیتلەر و مارکس و ستالین.

کۆستەر وای دەبینێت کە کوڕی قوربانی (The son victim) ی (بەرهەمی کەموکوڕیی باوك و دایك یان یەکێکیان) کە تووشی نەخۆشی بێباوەڕی بووە بەسێ قۆناغدا دەڕوات، بەپێی پێگەشتوویی تەمەنەکەی:

**١) قۆناغی منداڵی:** کە زۆربەی کات ئەو منداڵە دووچاری لاوازی و ملکەچی کردن و ناڕوونی دەستەواژە و ئامانجەکان دەبێتەوە، هەر وەك چۆن لە ڕووی قۆناغ و ئاستی خوێندنیش دوادەکەوێت، کە زۆربەی ئەو منداڵانە متمانەیان بەخۆیان لاوازە،

---

(١) - The Atheist Syndrome - john P. Koster- لە ساڵی ١٩٨٩ لە Wolgemuth & Hyatt بڵاوکراوەتەوە.

ئەمەش بەهۆی پشتگوێخستنیان لە لایەن دایك و باوکیانەوە و بە دەنگەوە نەهاتنی داواکارییەکانیان و جوێن پێدان و ئازاردانی جەستەیی و دەروونی. ئەو منداڵانەش بە خەمساردی و دڵەڕاوکێوە مامەڵە لەگەڵ دەورووبەریاندا دەکەن.

**٢) قۆناغی هەرزەکاری و دواتر:** وێنەکە بە شێوەیەکی لەناکاو بەتەواوەتی پێچەوانە دەبێتەوە، هەر کە دەرفەتێکی گونجاوی بۆ ڕەخسا، هەرزەکار هەوڵدەدات لە خێزانەکەی (کە ڕقی لێیەتی) ڕابکات و هەوڵدەدات مەودایەك لەنێوان خۆی و خێزانەکەیدا هەبێت و هەر کە دەگاتە ئاستێکی خوێندەواری، وا دەبینێت کە دایك و باوکی هەڵەن!! تا وای لێدێت وڵاتەکەی جێدەهێڵێت.

لەم قۆناغەدا شتەکان بە تەواوی دەگۆڕێن، ئەو منداڵەی لاواز و تەمبەڵ و شڵەژاو بوو، خۆی لەو کۆت و بەندەی باوکی ڕزگار دەکات و خۆی بەهێزتر و زیرەکتر و ژیرتر دەبینێت لەوەی خەونی پێوە دەبینێت. بە ئاسایی هەرزەکار لەم قۆناغەدا هەوڵ بۆ بنیادنانی ئەو بیرۆکانە دەدات کە بەهۆیانەوە دواتر گرنگی و ناوبانگ بەدەست دەهێنێت.

**٣) قۆناغی ڕەتکردنەوەی خود:** کارەساتەکە لە تەمەنی ٣٥ - ٤٠ ساڵی دەگاتە ئاستی تەواوەتی، چونکە کوڕی لاو کاتێك سەیری ئاوێنە دەکات خۆی وەك کۆپی باوکی دەبینێت بەو ئەندازەیەی کە بیری دەکەوێتەوە! چ پێشهاتێکی خراپە، کاتێك ڕقی باوك کە بەرەو دابڕان و خەمساردی برد لە تەمەنی منداڵیدا، بەرەو ڕەتکردنەوە و

یاخیبوون لە تەمەنی هەرزەکاریدا دەگۆڕێت بۆ ڕق بەرانبەر بە خودی خۆی، دوای ئەوەی بوو بە کۆپیەك لەو کەسەی ڕقی لێیە. ئەمەش دەبێتە هۆی ڕقی زیاتر بەرانبەر بە باوك، تا وای لێدێت لە هەموو شتێکی دنیا زیاتر ڕقی لێبێتەوە.

کاتێك ئەقڵ فەرمان بە لەش دەکات کە خۆی لەنێو ببات و ئەوە باشتر دەبینێت لەوەی وەك ئەو کەسە بێت کە ڕقی لێیەتی.

ئا لەم کاتەدا نیشانەکانی نەخۆشیەکی مەترسیدار (Psycho-somatic) دەردەکەون (بەبێ بوونی هیچ هۆکارێکی ئەندامی)، ئەو نیشانانە کەڵەکە دەبن تا ئەو ئەندازەیەی پەکی دەخەن. گرنگترین ئەو نیشانانەش:

- سەرئێشەی درێژخایەن

- خراپی هەستکردن

- لاوازی و تەمبەڵی لە ڕادەبەدەر

- ترس

- بێتوانایی لایەنی ئەقڵی تەنیا لە هەندێك خوتخوتە یان هەندێك هونەر نەبێت کە کەسانی زیرەك ئەنجامی دەدەن.

ئەمە خەمۆکییەکی درێژخایەنە، لاشەکانیان بوون بە دوژمنی و ئەقڵیشیان خەریکە دوژمنایەتی دەروونییان دەکات.

ئەگەر سەرنجی ژیاننامەی کەسایەتی سەرانی گەورەی ناباوەڕان بدەین، کە «کۆستەر» لێکۆڵینەوەی لەسەر کردوون «داروین- هاکسلی- نیچە- فرۆید»، ئەوە نیشانەکانی خەمۆکی درێژخایەن لە ژیانیاندا بەدی دەکەین:

١- هەر چواریان، دوای تێکچوونی تەندروستی جەستەییان بۆ ماوەیەکی درێژ ژیاون، تا ئەو ئەندازەیەی کە سیانیان نیوەی ژیانیان بەدەست کاریگەری نەخۆشییەکانەوە ناڵاندوویانە (ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەو نەخۆشییە دەروونییانە جەستەشیانی تێکداوە، هیچ هۆکارێکی ئەندامییان لە پشتەوە نەبووە).

٢- «هاکسلی و فرۆید» بە جنێودان بە خودا و ئایین لە شەپۆلی خەمۆکییەکەیان ڕزگار دەبوون!

هاکسلی کە بە سەگەکەی داروین ناسرابوو، باس لەوە دەکات کە زۆر ئاسوودە دەبوو و خراپ هەرسکردنیشی نەدەما کاتێك پێنووسەکەی دەگرتە دەست و شتێکی دژی پەرتووکی پیرۆز دەنووسی.

هەرچی فرۆیدە (لەوانی دیکە زیاتر ژیاوە) هەستی بەوە کردووە کە خەریکە گۆشتی بۆگەن دەبێت، تەنانەت سەگەکەشی وازی لێهێنابوو، فرۆید بە جنێودان بە ئایینی مەسیحی و جوولەکە خۆی لەو هەستە ڕزگارکردووە.

گومان لەوەدا نییە کە مرۆڤایەتی هێشتا بەدەست لێکەوتەکانی (سەردەمی ڤیکتۆری)ەوە دەناڵێنێت، کە کۆمەڵێك منداڵی قوربانی خستەوە، ئەوانەی باوکیان خۆیان لێ دوور دەگرتن بەو پێیەی بەرهەمی پەیوەندییەکی پیس و خراپ بوون، تا ئەو ئەندازەیەی ئەو کەسە ناتەواوانە لە ڕووی دەروونییەوە بوون بە بزوێنەری فکری سیاسی لە سەدەی بیستەمدا.

### ئیلحاد و زانست

ئیلحاد دژیەکی زۆری هەیە لەگەڵ زانستدا و بنەماکانی ئیلحاد یەکنایەنەوە لەگەڵ ڕاستیە زانستیە سەلمێنراوەکان، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە کتێبی (ئیلحاد وەك خۆی) لەوێدا زۆر بە وردی ڕوونمان کردۆتەوە چۆن ئیلحاد دژی زانستە.

### ئیلحاد و عەقڵ

ئیلحاد لە دەیان شوێندا دژی عەقڵە، لە دەیان شوێندا دژی بنەما کۆدەنگی لەسەرە عەقڵییەکانە، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە کتێبی (ئیلحاد وەك خۆی) و (بووونی باڵا) لەوێدا زۆر بە وردی ڕوونمان کردۆتەوە چۆن ئیلحاد دژی عەقڵە.

### ئیلحاد و زگماك

ئیلحاد وەك دژبوونی بۆ بنەما عەقڵی و زانستی و ئەخلاقییەکان بە هەمان شێوە دژی زگماك و فیترەتیش دەوەستێتەوە و دژی

فیترەتی پاکی مرۆڤە، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە کتێبی (ئیلحاد وەك خۆی) لەوێدا زۆر بە وردی ڕوونمان کردۆتەوە چۆن ئیلحاد دژی فیرەت و پاك و زگماکە.

## ئیلحاد و فەلسەفە

فەلسەفە واتا: بیرکردنەوە و بەدواداچوون و پرسیارکردن دەربارەی خۆم و خودا و خەڵك و کۆمەڵگە و بوون و گەردوون و ژیان و مردن و خێر و شەڕ و جوانی و ناشیرینی و باش و خراپ و خۆش و ناخۆش و تاك و خێزان و کۆمەڵگە و سیاسەت و ئابووری و ئەخلاق و ئایین و ئیلحاد و دادگەری و ستەم و واجب و ممکن و ئەستەم و سروشت و هۆش و ئەقڵ و فیکر و زانست و ناسین و خەیاڵ و مێژوو و یاسا و عیشق و خۆشەویستی و پەیوەندی و زمان و هونەر و... هتد.

کەواتا بەو پێیەی باسمان کرد فەلسەفە هیچ پەیوەندییەکی بە ئیلحادەوە نییە، وە فەلسەفە واتها: بیرکردنەوە و تێڕامان و بەدواداچون و پرسیارکردن، کەواتە فەلسەفە شوێنکەوتەی خاوەنەکەیەتی، ئەگەر کەسەکە مولحید بێ فەلسفە و بیرکردنەوەکەی دەبێتە فەلسەفەیەکی ئیلحادی، ئەگەر کەسەکە باوەڕدار بێ دەبێتە فەلسەفەیەکی باوەڕدار، ئەگەر کەسەکە موسوڵمان بێت وە لە چوارچێوەی ئیسلام بیربکاتەوە دەبێتە فەلسەفەیەکی ئیسلامی، ئەگەر... هتد.

کەواتا فەلسەفە بێلایەنە نە ئیماندارە نە مولحیدە، بەڵکو ئەوە کەسەکەیە دەیکاتە مولحید یان باوەڕدار.

بۆیە ئەگەر دیقەتی مێژوو بدەین فەیلەسووفە مولحیدەکان بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن، بەڵام ئیماندارەکان - مەبەستم لە ئیماندار موسوڵمان نییە، مەبەستم ئەوانەی بڕوایان بەخودا هەبووە - زۆر زۆرن، بۆ نموونە: سوقڕات، ئەفلاتون، ئەرستۆ، فاڕابی، ئیبن سینا، ئیبن ڕوشد، دیکارت، کانت،... هتد.

کەواتا: ئەوەی بڵێت فەلسەفە پاڵپشتی ئیلحادە یان فەلسەفە مولحیدە، ئەوە تۆزقاڵێك تێنەگەیشتووە لە فەلسەفە و هیچی لێ نازانێت، پێویستە بێت وەك قوتابییەکی سەرەتایی چۆك دادات بۆ تێگەیشتن لە فەلسەفە و فێربوونی فەلسەفە.

## ئیلحـــاد و ڕەوشـــت

بە دڵنیاییەوە ڕەوشت و خێر و شەڕ و چاکە و خراپە لەنێو زیهن و ئەندێشەی تاکی ناباوەڕدا ڕێژەیین و هیچیان بە ڕەهایی نین، بە واتایەکی دیکە ڕەوشت و هەموو ئەو هێزە ژیانبەخشانەی دیکەش لە شوێن و جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی دیکە دەگۆڕێن و دەشێت هەموشیان لە جێگایەکدا بوونیان نەبێت، بەوەش دەگەینە ئەوەی کە ڕەوشت وەك کایە سەرەکییەکە دەکرێت لە کۆمەڵگەیەکی ناباوەڕیدا بە هیچ شێوەیەك بوونی نەبێت و تاکەکان دوور لە هەموو ڕەوشتەکان بژین، جا ڕەوشتەکە هەر کۆمەڵگە و کەلتوور

سەپاندبێتی یان لە بیروباوەڕ و ئەندێشەی تاك و هەستكردن بە باشە و چاكەوە هاتبێت.

ئەوە مرۆڤە لێرەدا چاكە و خراپە و شەڕ و خێر دیاری دەكات بەپێی بەرژەوەندی خۆی، چی پێی خۆشە و باشە دەیكات هەر چەند خراپ و ناڕەوشتیش بێت، چونكە لای ئەو خۆشە و باشە، ئەو باش دەزانێت خراپەكان خراپن و زیانبەخشن و دەزانێت فڵان كار خراپە و ناشیرینە و ناڕەوشتییە و زەرەری هەیە، بەڵام حەزەكانی زاڵن و وای پیشان دەدات كە ئەو خراپەكان خراپ نابینێت و لای هەندێك لە مرۆڤە ئاییندارە پابەندەكان بەشێك لە كارەكان خراپ و بەشەكەی دیكە باشن.

ئەم قسەیەش بەڵگەی زۆر و گەورەی ناوێت و دەكرێت لە قسەی گەورە بێباوەڕان و دەمڕاستانی جیهانی ئیلحاد قسەكان وەربگرین، هەروەك «داوكینز» دەڵێت: «مرۆڤ تەنها چڵكێكی كیمیاییە.»

بۆیەش لێرەوە بۆمان دەردەكەوێت مرۆڤ لە ڕوانگەی ئیلحادەوە بەرهەمی سروشت و ماددەیە، ماددە و سروشتیش خاڵین لە ڕەوشت و بەهای باڵا و مەعنەوییەت، لەوێشەوە مرۆڤ وەك هەر هەبوویەكی دیكە كائینێكی ماددی و بەرهەمی سروشتە. كەواتا ئەویش وەك سەرجەمیان ناڕەوشتییە و لەسەری پێویست نییە كە خۆی پابەند بكات بە هیچ ڕەوشت و چاكەیەكەوە.

بۆیە هیچ ڕێگرییەك نییە لە دەستبردن بۆ هەر شتێك كە ئارەزووەكانی تێر كات، كەواتا ناباوەڕی جیاوازی نێوان سەگ و پشیلە و مرۆڤ و ئەمیبا ناكات و هیچ پێوەرێكیش نییە بۆ جیاوازیكردن لەنێوانیاندا، چونكە هەموویان بەرهەمی سروشت و مادده و پەرەسەندنن، ماددەش سۆز، و بەزەیی، ڕاستگۆیی، دادپەروەری، ئەمانەتپارێزی، چاكەكاری، چاكەخوازی و یارمەتی ئەوانی دیكە نازانێت، هەر بۆیە سێكس بە هەموو جۆرەكانییەوە ڕێگەپێدراوە، ئەگەر لەگەڵ دایك و خوشك و كەسە نزیكەكانیش بێت، یان خراپەكاری و دەست درێژی و... هتد.

مرۆڤەكان لە ناخیاندا هەست بە بوونی چاكە و خراپە دەكەن و دەزانن چی خراپە و چی چاكە، ئاسان و سادە دەتوانن لە یەكیان جیا بكەنەوە، ئەمە بە بۆچوونی ئیلحاد تەنها بازدانێكی جینی و هەڕەمەكییە كە وای لێكردوە گومان ببات ئەمە خێرە و ئەم خێرە خەیاڵاوییەی خۆش بوێ، ئەمەش شەڕە و ڕقی بێت لەم شەڕە خەیاڵاوییە.

كاتێك داوكینز پرسیاری لێكرا كە ئایا باوەڕت بەوە هەیە دەستدرێژی سێكسی هەڵە بێت؟ شتێكی تەواو لە خۆڕایی و بێبنەمایە وەك ئەو واقیعەی كە بە پێنج پەنجە گەشەمان كردووە، لە بری شەش پەنجە؟

له وەڵامدا دەڵێت: «بەڵێ دەتوانم ئەو قسەیە بکەم.» واتا: دەکرا پەرەسەندن ڕێڕەوێکی دیکە بگرێ کە لە ئەنجامدا هەستی مرۆڤ دەستدرێژی سێکسی بە هەڵە نەزانێ پێی شتێکی باش و گونجاو بێت.

وە بەم پێیە بابەتەکە شتێکی تەواو بێبنەمایە و ناگونجێ وەسفی هیچ کام لەو دوو هەستە بکرێت بەوەی دەستدرێژی سێکسی هەڵەیە یان پەسەندە، ناتوانرێت وەسف بکرێت کە ڕەوایە یان ناڕەوایە، چونکە ئەو هەستە تەنها و تەنها بەرهەمی هەڕەمەکی و ڕێکەوتە. کەواتا هەست و خواستی ڕەوشتی لای بێباوەڕ سەرچاوەکەی نازانرێت و ناتوانرێت بە ڕەوا یان ناڕەوا وەسف بکرێت، هەروەها هیچ لێپرسینەوەیەکی لەسەر نییە، کەواتا کەس ناتوانێت بەڕەهایی بڵێت: ئەوە باشە یان ئەوە خراپە. هەر بۆیە دوکتۆری بێباوەڕ «دان بارکەر» دەڵێت: «دەستدرێژی سێکسی ڕەنگە شتێکی ڕەوشتی بێت ئەگەر پێویستمان پێی ببێت!»

وە هەروەها لە پرۆفیسۆری بێباوەڕ «لۆرانس کراوس»یان پرسی کە بۆچی کاری نەشیاو لەگەڵ دایك و خوشك بە هەڵە دەژمێردرێت؟

ئەویش وتی: «ڕوون نییە لام هەڵە بێت!»

هەروەها پرۆفیسۆری بێباوەڕ «پیتەر سینگەر» دەڵێت: «زۆر ئاساییە مرۆڤ و ئاژەڵ پەیوەندی سێکسی ببەستن کە ڕازیکەر بێت بۆ هەر دوو لا»![1]

---

(١) - کاتێکیش ستوبلفیلد دەستدرێژی کردە سەر دی جی و بە ١٢ ساڵ

هەر ئەو پرۆفیسۆرە پشتیوانی کوشتنی لە دایکبووە تازەکان دەکات کە تووشی کەم ئەندامی بوون، ئەگەر لە بەرژەوەندی خۆیان و دایك و باوکیان بێت!

هەروەها «دیڤید سیلڤەرمان» سەرۆکی کۆمەڵەی بێباوەڕەکانی ئەمریکی لە دیبەیتێکدا بەئاشکرا وتی: «هەموو بەها ڕەوشتییەکان ڕێژەیین و هیچ ڕەوشتێکی ڕەها بوونی نییە!» پێیان وت: کەواتە لەسەر ئەو بنەمایە سزادانی منداڵ و خواردنیان بۆ نموونە هەڵە نییە بەڕەهایی، بەڵکوو بە لای کەسێکی دیاریکراو هەڵەیە، وایە؟! سلیڤەر دانی بەمەدانا.

بۆیە تێڕوانینی ناباوەڕی بۆ دەستدرێژی سێکسی و سێکس لەگەڵ ئاژەڵاندا یان لەگەڵ منداڵاندا یان لەباربردن و لەنێوبردنی کەمئەندامەکان و خواردنی گۆشتی منداڵ ئاساییە. هەموو ئەمانە شتی ڕێژەیین و کەس ناتوانێت بەڕەهایی بڵێت خراپن یان باشن، بەڵکوو بەپێی کەس و بارودۆخ دەگۆڕێت.

---

زیندانی حوکم درا، سینگەر و جیف ماکماهان بەرگرییان لە ستوبڵفیلد کرد، سینگەر و ماکماهان هەر دووکیان ئەوە دەخەنە ڕوو کە کاتێك کەسێك نە توانایی هەیە و توانای ئیدراکی کەمە و ناتوانێت لە ڕازیبوون بگات، کاتێك دەستدرێژی دەکرێتە سەر ڕەنگە پێی خۆشبێت. بە لای سینگەرەوە دەستدرێژی سێکسی بۆ سەر خاوەن پێداویستی ئەقڵی و جەستەیی لە بنەڕەتدا بە دەستدرێژی دانانرێت، ئەگەر هاتوو ئەو خاوەن پێداویستییە لە چەمکی ڕازیبوون تێنەگات. (مرۆڤە بێویستەکان، ل ٤٣٩. ئاڤار قەرەداغی).

بۆیە دەبینین لە ناباوەڕیدا هەموو شتێك ئاساییە و هیچ سنوور و لەمپەر و بەربەستێك نییە لەبەردەم ناڕەوشتیبوون و خراپەکاریدا.

هەر بۆیە لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێت: «خیانەتی زەوجی و خواردنی گۆشتی منداڵی دوژمنەکەت زۆر ئاساییە.»

هەروەها یەکێکی دیکە لە ڕێبەرانی ناباوەڕی کە «سام هاریس»ـە، دەڵێت: «زۆر ئاساییە ژن لەگەڵ هەر کەسێك ڕابوێرێت.»

ئەمانەش هەموویان لەبەرئەوەن کە ناباوەڕی پێناسەی بۆ چاکە و خراپە نییە، بەڵکوو دەڵێت چاکە ئەوەیە کە تۆ پێت چاکە یان زۆرینەی خەڵکی یان زانست، خراپە ئەوەیە کە تۆ پێت خراپە یان زۆرینە یان زانست، بەڵام بە ڕاستی ئەمە قسەیەکی زۆر زۆر بێ بنەمایە، چونکە ئەگەر تۆ بۆ خۆت بڕیار بدەی یان زۆرینە، ئەوە بەدڵنیاییەوە چیت پێخۆشە ئەوە دەکەی بەبێ گوێدانە بەرانبەر و کۆمەڵگە و هیچ یاسا و ڕێسایەکی ئاسمانی و زەمینی، هەروەها دەرگایەکی زۆر فرەوانی ئەنانییەت، خۆپەرستی، ئارەزووپەرستی و ماڵوێرانی تاك و کۆمەڵگە و دەوڵەت و... هتد، لێ دەکەوێتەوە.

هەر ئەم فیکرەشە کە وای لە مرۆڤ و سیاسەتی ئێستای جیهان کردووە کە هیچ سنوورێك نەهێڵنەوە و هەموو سنوورەکان ببەزێنن و ئەو هەموو کاولکاریی و ماڵوێرانییە تووشی مرۆڤ و مرۆڤایەتی و جیهان بکەن، ئەوە زۆرینەیە کە زۆر جار بڕیار لە داگیرکاری و وێرانکردنی ژێرخان و سەرخانی وڵاتانی بێدەسەڵات دەدەن و

وێرانیان دەکەن بەبێ هیچ بەزەیی و ڕەوشتێك، وە ئەگەر بشڵێت: لە زانست وەریدەگرین هەر بێ بنەمایە، چونکە یەکەمیان: زانست لە شتە نامادییەکان ناکۆڵێتەوە، بۆیە زۆر جار ناتوانێت بڕیار بدات، و دووەمیان: بەها ڕەوشتییەکانیش زۆربەیان مەعنەوی و نامادین، بۆ نموونە: ئەنانییەت و خۆپەرستی و درۆکرن و ئیرەیی و خیانەت. یان بۆ نموونە: کوشتنی کەسانی کەمئەندام کە بوونە ئەرك بەسەر کۆمەڵگەوە و ئیلحاد و زانست و ئەقڵیش ڕێی لەنێوبردنیان دەدەن، چونکە دەڵێن زەرەریان هەیە و بارن بۆ مرۆڤ، بەڵام ئایا ڕەوشتییە؟!

هەر بۆیە «ڕیچارد داوکینز» دەڵێت: «نە چاکە هەیە نە خراپە، بەڵکوو ئێمە هەموومان بۆ مۆسیقای (DNA) خەریکی سەماکردنین.»

ئەگەر دەشڵێن: ئەقڵ بڕیاردەرە، دیسانەوە زۆر بێ بنەمایە، چونکە ئەقڵ دەکەوێتە ژێر کاریگەری هەوا و ئارەزوو و بەرژەوەندی تاکەکەسی و خۆپەرستی و خۆسەپێنی، باشە ئەوەی ئەمریکا دەیکات بەرانبەر بە هەموو جیهان لەو هەموو قۆرخکارییە و داگیرکاری وماڵوێرانی و کاولکاری و ئەوەی نازییەکان کردیان بەرانبەر بە جوولەکەکان یان ئەوەی یەکێتی سۆڤیەت کردی بەرانبەر موسوڵمانان و غەیرە موسوڵمانان، ئەمە جگە لەو وەحشیگەرییەی کردیان لە شەڕی یەکەم و دووەمی جیهانی.

هەموو ئەمانە ڕوودەدەن کاتێك عەقڵی ئەوان بوونی هەبووە، بۆیە ناکرێت عەقڵ بنامەیەکی ئاقڵانە بێت بۆ ڕەوشتنامەیەکی یەکلاکەرەوە کە سەرجەم مرۆڤەکان لەسەری بڕۆن.

هەروەها لەڕوویێکی دیکەشەوە خۆ ئەگەر بشوترێت سەرچاوەکەی ئەقڵە، ئەوا دیسان خۆ بنەما ئەقڵییە نەگۆڕەکانیش هەر دەچنە نێو بنەما فیترییە مرۆییە خواکردییەکە، کەواتا مادده و سروشت ناتوانن بنەمای ئەقڵی و ڕەوشتییەکان داڕێژن و بیانچێنن و بیان گشتێنن؟

## بۆچی ئیلحاد دژی ڕەوشتە؟!

بەکورتی، بۆچی ئیلحاد ڕەوشتی تێدا نییە؟![١]

---

(١) بۆ زانینی سەرچاوەی ئەو وتانەی کە هێنامانن بگەڕێنەوە بۆ (منتدی التوحید) بەتایبەت نووسەرێك بە ناوی: (محمد الباحث)، بە ناونیشانی (فضائح إلحادية وأخلاق داروينية إجرامية) واتا: (شورەییە ئیلحادییەکان و ڕەوشتە داروینییە تاوانبارەکان)، هەروەها کتێبی (شموع النهار وإطلال على الجدل الديني الإلحادي المعاصر في مسألة الوجود الإلهي) ی، دوکتۆر عبد الله العجيرى، لاپەڕە (٦٦) بەدواوە،

https://www.conservapedia.com/List_of_atheist_shooters_and_serial_killers

https://www.conservapedia.com/Atheistic_Sweden_and_rape

http://www.internationalskeptics.com/forums/show-

١- مرۆڤ لای ئەوان ماددەیەکی پیسە، وەك «ستیڤن هۆوكینگ» دەڵێت، یان چڵکێکی کیمیاییە، وەك ڕیچارد داوکینز دەڵێت.

٢- مرۆڤ بەشێکە لە سروشت و بە بازدانێکی جینی هەڕەمەکی گەیشتووە بەو حاڵەی ئێستای، ئەوە ئەوەیە وای لێکردووە بە هەندێ شت بڵێت: چاك و بە هەندێکی دیکەش بڵێت: خراپ، بەڵام دەکرێت وا نەبێت.

٣- ڕەوشت هەر هەمووی ڕێژەییە و ڕەوشتی ڕەهامان نییە، واتا هیچ شتێك نییە بەڕەهایی بوترێ باشە یان خراپە.

٤- خاوەنی نییە، وەك باوەڕدار کە هەردەم هەستبکات خاوەنی هەیە و چاوی لێیەتی و چاودێری دەکات.

٥- بڕوای بە زیندووبوونەوە نییە، بۆیە ئەوەی پێی دەکرێت و حەزی لێیەتی دەیکات، هەر چەند خراپ و ناڕەوشتیش بێت. هەر بۆیە فەیلەسووف و دەروونزانی ڕووسی «دۆستۆیڤسکی» دەڵێت: «ئەگەر خودا نەبێت، هیچ شتێك قەدەغە نییە.»

---

thread.php
https://www.youtube.com/watch?v=rlH33btuhdM
https://youtu.be/5a_sZgZCTX0
/http://www.mrctv.org
http://m.youtube.com/watch?v=VZJ3tEGc2BM
http://m.youtube.com/watch?v=8IOL12MvXXQ

٦- مرۆڤ لە چوارچێوەی ئایینی ڕاست و پەیامی خوداییدا نییە، تاکوو چاکە و خراپەی بۆ دیاری بکات و پێوەی پەیوەست بێت، بەمەش هیچ قەید و بەند و بەستنەوەیەك مرۆڤ ناگرێتەوە و مرۆڤ بە هیچ ڕەوشتنامەیەکەوە پابەند نییە، بەڵکوو هەموو ئەوەی هەیە حەز و ویستەکانییەتی و ئەوان ڕێگای بۆ دیاری دەکەن.

٧- لێرەوە مرۆڤ دەبێتە هەبوویەکی لە ڕادەبەدەر دڕندە، چونکە دڕندەکان دڕەندەن، بەڵام عەقڵ و توانا جەستەییەکانیان زۆر سنووردارە و ناتوانن وەك مرۆڤ کاری دڕندانە بکەن، بەڵام کاتێك مرۆڤ لە مرۆڤبوون کەوت و حەزە ئاژەڵییەکان بەسەریدا زاڵ بوون، ئەوە سەیر دڕندەیەك دەردەچێت.

بۆیە یان ئەوەتا تاکی بێباوەڕ دەڵێت: «چاکە و خراپە و ڕەوشتی و ناڕەوشتی بوونی نییە»، کە بینیمان ئەم ڕایە چەند دژی ئەقڵ و فیترەت و زانست و مرۆڤ و مرۆڤایەتییە.

یانیش دەڵێت: «باش و خراپ هەیە و ڕەوشت بوونێکی بابەتی و ڕەهای هەیە»، ئەو کات تووشی تێکەوتنێکی خراپی دژ بە ئایدیاکەی دەبێتەوە، ئەویش وەڵامی ئەو پرسیارەیە کە ئاخۆ کێ وات لێدەکات کە پابەند بی بەو ڕەوشتانەوە؟! چونکە ئەو کات ڕەوشت دەبێتە شتێکی سەلمێنراو و بابەتی و دەرەکی و سەربەخۆ، خۆ ئەگەر بڕوایان بە ڕەوشتی باشیش هەبێت، ناتوانن دەریخەن، چونکە پاڵنەری خودا و چاودێری و لێپرسینەوەیان نییە، ئەگەر

شتێکیشیان پێ خراپ بێت هەر ناتوانن لێی بگەڕێنەوە، چونکە دووبارە هەوا و نەفس ئارەزوو لێیان ناگەڕێ، هەروەها هیچ ڕێگرییەکیش بوونی نییە وەك خودا و چاودێری خودایی و لێپرسینەوە و زیندووبوونەوە.(١)

باوەڕداران هەموویان کۆکن لەسەر ئەوەی دەبێت شوێنکەوتەی ڕەوشت بن، بۆیەش سەرچاوە جیاوازەکانی ڕەوشت بەکاردەهێن کە دەگەڕێتەوە بۆ باوەڕی باوەڕدارەکە، بەڵام ئەم کۆدەنگییەی باوەڕداران بۆ پیادەکردنی ڕەوشت بە مانای خودی پیادەکردنەکە نایەت، بەڵکوو بەشێکیش لە باوەڕداران پەیڕەوی حەز و پاڵنەرە شەڕانییەکەی ناخیان دەکەن، بەمەش لە کۆی گشتی مرۆڤایەتیدا، بە درێژایی مێژوو ملیۆنان خەڵك لە شەڕ و تێك هەڵچوونەکاندا کوژراون، کە یاسای بنەڕەتی بۆ ئەم کارە ئەوە بووە کێ دەسەڵات و هێز و قەڵا و چواردەور و تواناکانی قایمتر بوون، دەستیان درێژ کردووە بۆ چواردەور، بگرە لەمپەڕ بۆ ئەو پەڕی سەرزەویش بەگوێرەی تواناکانیان هێرشیان کردووە.

داوکینز لە (God Delusion)دا دەڵێت: «جەنگ و وێرانکارییە گەورەکان لەسەر دەستی ئایینەکان ڕوویداوە، باشترین چارەسەریش ئەوەیە کە مرۆڤایەتی بەشێوەیەکی گشتی واز لە ئایین و بیروباوەڕ بهێنێت»، بەڵام داوکینز لە بەرنامەیەکی

---

(١) - پاکانەی هەبوون- موحەممەد صاڵح – چاپی یەکەمی ٢٠٢٠

تەلەفیزیۆنیدا کە پرسیاری لێدەکەن دەربارەی ئەو جەنگ و کوشتارەی کە ستالین و ناباوەڕانی دیکەی جیهانی دروستیان کرد، ناتوانێت هیچ وەڵامێك بداتەوە، تەنها دەڵێت: «ستالین کەسێکی مەی خۆر بوو، بۆیە تووشی ئەو هەڵە گەورانە بووە!!»

قسەیەکی بەهێزی سام هاریس هەیە کە ڕوونکردنەوەیەکی باشی بیروباوەڕی ئیلحادییە بەرانبەر باوەڕداران و دەڵێت: «هەندێك باوەڕ زۆر مەترسیدارە، بۆیە ئەگەر خاوەنی ئەو باوەڕانە بکوژرێن و لەنێو ببرێن ئەوا کارێکی ڕەوشتییە.»[١]

بۆیە گەواهی ناباوەڕان بۆ ئەو کوشتارەی باوەڕداران کردوویانە بەهۆی باوەڕەکەیانەوە و باوەڕی ناباوەڕان بۆ لەنێوبردنی خاوەنی هەندێك لە باوەڕەکان! ئاڵۆزی دروست دەکات ئەگەر لە بەرانبەر کردەوە کوشتاریەکەی ناباوەڕاندا هەڵنەسەنگێنرێت، ئەمەش ڕەواج دان نییە بە هەر جۆرە کوشتنێك کە ڕەنگە لەنێو مرۆڤایەتیدا لەسەر دەسەڵات و باوەڕ ئەنجام بدرێت، بەڵام پاکانەیەکی ڕەوایە بۆ تێگەیشتن لەو بانگەشەیەی ناباوەڕان و باوەڕدارانیش دەربارەی ڕەوشتنامە و ئاشتی و ئازادی بەرزیان کردۆتەوە.

---

(١) - M. Pava، Jewish Ethics as Dialogue: Using Spiritual Language to Re-Imagine a Better World، لە ساڵی ٢٠٠٩ لە Springer بڵاوکراوەتەوە، لاپەڕە ١١٨

نموونە ناباوەڕییەکان کارەسات سازێنن و کۆمەڵکوژی گەورە و سامناکیان ئەنجامداوە، وەك: کۆمەڵکوژیەکانی ستالین و ماو سیتۆن کە ملیۆنان کەس لەسەر دەستی ناباوەڕییەکەی ئەوان کوژراون، جێی سەرنجە کە قوربانییەکان لە مێژوودا ئەو کاتانە زیاتر و کارەسات ئامێز و دڵڕەقانەتر بوون کە ئاتیستەکان ڕابەر و سەرکردەبوون.[١]

بۆیە لێکۆڵەران پێیان وایە کە پەیوەندییەکی توند لەنێوان تاوانکارییەکان و ناباوەڕیدا هەیە، بۆیەش نووسەری ئەمریکی «دینیش د سەوزا»[٢] دەنووسێت: «مرۆڤی ناباوەڕ لەو شوێنەوە تووشی تاوانکاری دەبێت کە پێی وایە داهێنەری ڕەوشتەکان خۆیەتی نەوەك خودا، بە بەکارهێنانی تەکنەلۆجیا و زانست خەڵکی لە خودا ڕادەکەن، لێرەشدا بەهەشتی عەلمانییەتیان لەسەر زەویدا دروست کردووە، ئەگەر کەسانێکیش (وەك جوولەکەکان) کە گەلێکی کۆنی سەر زەوین بوونیان هەبوو، دەبێت لەنێو ببرێن!! بۆ ڕازاندنەوەی بەهەشتە دروستکراوەکە، هەر ئەوەش بەرهەمی دەستی ستەمکاری ناباوەڕانە، هەرکەسیش ئیعتیزاریان بۆ بهێنێتەوە ئامادەیان دەکات بۆ کوشتوبڕی زیاتر، کە هەموویان

---

(١) - لە پەرتووکی (Morality Without God?) لە نوسینی (Walter Sinnott-Armstrong) لە ساڵی ٢٠٠٩ لە (Oxford University Press) بڵاوکراوەتەوە، لاپەڕە ٢٨

(٢) - (dinesh d'souza) نوسەری ئەمەریکی بەڕەگەز هیندی (١٩٦١)

جەخت لەسەر قسەکەی «فیودور دوستویفسکی» دەکەن کە دەڵێت: ئەگەر خودایەك بوونی نەبێت، هەرچی دەکەی بیکە و ئازادیت.»

لەم چوارچێوەیەشدا مامۆستای پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی زانکۆی کیلی بەریتانی «ناڤید شەیك» (Naveed S Sheikh)، توێژینەوەیەکی کرد بە ناونیشانێکی سەرنجڕاکێش بە ناوی «ژمارەی کوژراوان»، تیایدا باسی هەموو ئەو جەنگانە دەکات کە لە سەردەمە جیاوازەکاندا ڕوویانداوە لەسەر دەستی دەوڵەت و بیروباوەڕە جیاوازەکان، لەنێو توێژینەوەکەی ئەودا ئەو جەنگانە هەژماردەکرێن کە ژمارەی کوژراوان لە ١٠ هەزار زیاتربن، لە سەرەتای بەرواری زایینییەوە هەتاکو ساڵی ٢٠٠٨ لە سەرجەم شارستانییەتە جۆراوجۆرەکاندا.

ناڤید سەرجەم ئایین و ژیارییە جۆراوجۆرەکانی کرد بە ٧ بەشی سەرەکییەوە کە لە ماوەی ٢٠٠٨ ساڵدا ٢٧٦ ڕووداوی جۆراوجۆر ڕوویداوە، کە ئەنجامەکە بەم شێوەیە بوو[١]:

لەسەر دەستی ئایینی مەسیحی زیاترین کەس کوژراوە لەسەر زەویدا، لە دوای ئایینی مەسیحیش شارستانییەتی ناباوەڕان دێت کە زیاد لە ١٠٠ ملیۆن کەس لەسەر دەستیان کوژراوە، هەر

---

(١) - https://www.aljazeera.net/،
الالحاد والعنف.. کیف صنع ملحدون اهم مجازر العالم وحروب؟ ٢٠١٨.

توێژینەوەکە ئاماژە بە ئەوەش دەکات کە کۆی گشتی کوژراوان لە ژێر دەستی فەرمانڕەوایەتی ئیلحاددا دەگاتە ١٥٠ ملیۆن کەس.

| شارستانییەتەکان | کوژراو ٪ |
|---|---|
| مەسیحی | ٪٣٠,٧٣ |
| مەسیحی | ٪١٥,١٩ |
| بێباوەڕان | ٪٢١,٦٤ |
| سین | ٪١٨,٦٤ |
| بدائی (Primitive) | ٪٧,٨٧ |
| ئیسلام | ٪٥,٥٢ |
| بوزی | ٪٠,٤١ |

ئەمەش لەگەڵ ئەو پڕوپاگەندە ساختەیە یەك ناگرێتەوە کە دەڵێن: «ناباوەڕی و سەلامەتی، یان ئاشتی و ناباوەڕی»، بۆیە مێژوو و ئێستاش پێمان دەڵێن ئیلحاد بێتاوان نییە!!

ئەم دڵڕەقییە ڕەنگە لەوەوە سەرچاوە بگرێت کە ناباوەڕان تێڕوانینێکی ڕوونیان بۆ ڕەوشت نییە، پێیان وا نییە یاسا ڕەوشتییەکان و ڕەوشتنامەکان بەهایەکیان هەبێت، بەڵکوو لە ئاستی بەرزی ناباوەڕیدا هەموو ڕەوشت بەستراوەتەوە بە کلتوورەوە کە ئەوەی لای من ڕەوشتە لای ئەو ڕەوشت نییە، ئەوەشی لێرە باشە لەوانەیە لە شوێنێکی دیکە خراپ بێت! ئیتر بەهایەك نامێنێتەوە بۆ ڕەوشت

و دەكرێ هەموو كارەكانمان باش و خراپ بن لە یەك كاتدا و بەپێی شوێن بگۆڕێت.

ئەمەش بەوە پشتی ئەستوورە كە ناباوەڕی پێودانگی نییە تا لەسەری بڕوات، تەنها حەزەكان ڕەوشتن، ئەگەر پێویستیان بە تێركردنی حەزەكانیان بوو، ئەوە دەتوانن هەرچی بۆیان كرا بیكەن وەك خۆیان دەڵێن.

سێ تێڕوانینی گرنگ لای ناباوەڕان بۆ ڕەوشت هەیە، كە (Expressivism) و (Error Theory) و (Realism)ن و ماناكانیان بەم شێوەیەیە[1]:-

Expressivism تیۆری دەربڕین: بەها ڕەوشتییەكان هیچ مەرجێكی ڕاستیبوونیان تێدا نییە و دادگایی ڕەوشتی هیچ بەهایەكی ڕاستی هەڵناگرێت، (ئەمەش واتا: هەر تاكێك ئازادە لە پیادەكردنی كارە ڕەوشتییەكانی و نابێت دادگایی بكرێت لەسەر دەستدرێژییە ڕەوشتییەكانی)، یەكێك لە پەرەپێدەرانی ئەم تێڕوانینە فەیلەسووفی ماددیگەرایی ئەلفرەید ئەیەرە (Alfrid j. Ayer).

Error theoryتیۆری هەڵە: كە پێی وایە لێكدانەوە و تێڕوانینە ڕەوشتییەكان هیچی ڕاست نییە و هەڵەی خەیاڵ سەرچاوەكەیەتی.

---

(١) - (Moral Error Theory) لە نووسینی (Wouter Floris Kalf) كە لە لاپەڕە ١٧٧و ١٧٨ی ساڵی ٢٠١٨ لە چاپخانەی (Springer) لە چاپدراوە.

moral realism تیۆری ڕیالیزم (واقع): که پێی وایه چەسپاوی بوونی نییه و دەکرێ هەموو بەهایەکی ڕەوشتی ڕاست بێ یان هەڵە (واتا: بەپێی شوێن و کات دەگۆڕێت).

## ئیلحـــاد و ئامـانج

ئامانج و مەبەست لە ژیاندا بوونی نییه له ئیلحاددا، چونکه بێخاوەن و بەرنامه و پەڕاوی ئەخلاقی و ئایینی، له ئیلحاددا ئەخلاق مامەڵەیەکی نالۆجیکی نادروستی لەگەڵ دەکرێت، بەو پێیەی له زیهن و جیهانبینییاندا ڕۆژی دوایی و زیندووبوونەوە و لێپرسینەوە بوونی نییه و مردن کۆتایی ڕێگاکەیه و بوونێکی دیکەت نییه.

به پێچەوانەی باوەڕدارانەوە که لایان مردن به مانای نەمان نایەت و تەنها گواستنەوەی مرۆڤەکانه له قۆناغێکی کاتییەوە بۆ قۆناغی کۆتایی و هەمیشەیی.

بەڵام له لای ناباوەڕان ئامانج و مەبەست بوونی نییه، چۆن ژیان دەبەی بەڕێوه بیبه، وەك هەر دروستکراوێکی دیکه له گەردووندا، وەك حوشترێك یان گەردیلەیەك، وەك ڤایرۆسێك یان ڕەشەوڵاخێك و مشك و مار و مەگەزێك، چونکه سەرچاوەی هەموویان سروشت و ماددەیه و سروشت و ماددەش ئامانج و مەبەستییان نییه.

بۆیه (بێرتراند ڕاسل) جەخت لەسەر بیری بێ ئامانجی و نەبوونی مەبەست دەکاتەوە و دەڵێت: (ژیان بێ واتایه و هیچ حیکمەتێکی له پشتەوە نییه)، هەروەها مولحیده نوێیەکانیش وەکو

(ڕیچارد داوکینز) جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە: (ژیان بێ دیزایین و بێ ئامانجە، خاڵییە لە چاکە و خراپە، جگە لە گوێ نەدان بە ئازار هیچی دیکە بوونی نییە).

لە شوێنێکی دیکەدا (داوکینز) دەڵێت: (ئێمە ئامێرێکین لەلایەن (DNA)یەوە دروستکراوین، ئامانجیشمان کۆپیکردنەوەی زیاتری هەمان (DNA)یەکەیە).

هەروەها دەڵێت: (پرسیاری ئەوەی بۆچی ئێمە لێرەین، پرسیارێکی پووچ و بێمانایە، چونکە هیچ مەبەستێك لە دروستکردنی مرۆڤدا نییە، هەر وەکو پرسیاری دروستبوونی شاخەکان وایە).

هەروەها فەیلەسووفی مولحید (کوینتن سمیث) دەڵێت: (ئێمە لە هیچەوە هاتووین، بەبێ هیچ، لەپێناو هیچ).

هەر بۆیەشە ڕێژەی خۆ کوشتن لەنێو ئەم جۆرە کەسانە زۆر زۆرە، چونکە ئەمانە ئەوە تێڕوانینیانە بۆ ژیان، کەسێکیش وا بیر بکاتەوە زۆر لای ئاساییە خۆی بکوژێ، چونکە پێی وایە بوون و نەبوونی یەکسانە، بۆیە دەبینین کاتێك لە مردن نزیك دەبنەوە گوزارشت لە نائامانجداری و نەبوونی مەبەست دەکەنەوە و بەئەسەفەوە گوزارشت لەو بێئامانجییە دەکەن.

بەپێی ڕاپرسی و سەرژمێرییەکی ڕێکخراوی گالوپ بۆ ساڵی (٢٠٠٥ - ٢٠٠٦)، ئەو وڵاتانەی ڕێژەی ئاییندای تیایانا بەرزە ڕێژەی خۆکوشتن تیایاندا نزمە، ئەوانەشی ڕێژەی ئاییندای تیایانا

نزمە ڕێژەی خۆکوشتن بەرزە. بۆ نموونە ئیستۆنیا کە لەنێو ئەو ٦٧ وڵاتەی ڕاپرسییەکەیان لەسەر کراوە بێدینترینە، لەگەڵ ئەوەشا ڕێژەی خۆکوشتن لێی زۆر بەرزە. یابان و ڕووسیاش بە هەمان شێوە.

بۆیە (ڤۆڵتێر) هاواری دەکرد: (چ سەرەنجامێکی خراپە، لە نەبوونی و بێئامانجی و عەدەمدا فەنا ببم).

هەروەها فەیلەسووف تۆماس کارلایك (Thomas Carlile)، دەیگوت: من تەنیا مرۆڤێکی پیری بێتوانام کە خەریکم لە سەرەنجامێکی نادیار نزیك دەبمەوە.[١]

وەك ڕزگاربوونیش زانای لاهوتی قەشە (ئۆگستین) و زانا و فیزیایی و پیاوی ئایینی فەڕەنسی پاسکاڵ وەسفی چارەسەرەکەیان کردووە کاتێك گوتوویانە: (تەنیا لەگەڵ خودا لە ئارامیداین)[٢].

---

(١) Thomas Carlile فەیلەسووف و مێژوونووسی بەناوبانگی سکۆتلەندی (١٧٩٥ - ١٨٨١).

(٢) بۆ سەرچاوەی ئەو وتانە بگەڕێوە بۆ کتێبی ئیلحاد گرفتێکی دەروونییە، دەروونناسی ئیلحاد، أ.د. عمرو شریف، وەرگێڕانی، مزەفەر عەوڵا قەسرێ، لاپەڕە (١٨٣).

## ئیلحـــاد و هـــیوا

هەرکەس بیەوێت ئیلحاد وەك خۆی پیشان بدات ئەوا سادە و ساکار ئەوە دەزانێت و بۆی ڕوون دەبێتەوە کە ئیلحاد وا لە مرۆڤ دەکات بێهیوا و ڕەشبین بێت بەرانبەر هەموو کایە جیاوازەکانی ژیان، چونکە ئەو هیوای تەنیا لەسەر چەند ساتێك و کاتێك هەڵچنیوە و بیر لە شتێکی دیکە ناکاتەوە و بڕوای بە دواڕۆژ و زیندووبوونەوە نییە، تۆزێك ناخۆشی تووش ببێ بەرگە ناگرێ و بێئومێد و هیوا دەبێ لە ژیاندا، بەڵام کەسی باوەڕدار هەر چەند تووشی ناخۆشی و نەخۆشی ببێ هیوا و ئومێدی زۆر هەیە بە خودا و دواڕۆژ و قەرەبووی قیامەت، بە ئومێدەوە لە ژیان دەڕوانێ و بێهیوا نابێ لە ژیان و خودا و دواڕۆژ.

بۆیە فەیلەسووفی ئەڵمانی مولحید (نیچە) دەڵێت: (ژیان هەمووی وێنەیەکە لە بەدبەختی و موعانات و ناخۆشی و ماڵوێرانی).

هەروەها دەڵێت: (من باش دەزانم بۆیەش مرۆڤ پێدەکەنێ لەنێو هەموو زیندەوەراندا، چونکە هەر ئەوە ناخۆشی و بەدبەختی دەچێژێ و بۆیە ناچار بووە لای خۆیەوە پێکەنین دابهێنێ تاوەکو دڵی خۆی خۆش کات).

کەواتا ئەو ئەوەندە بە بێهیوایی و بێئومێدی لە دنیا دەڕوانێ هەتا گەیشتووە بەوە کە بڵێت: پێکەنینیش دەستکردی مرۆڤە و لە ناچاری دایهێناوە.

هەروەها فەیلەسووفی ئینگلیزی (هربرت سینسر) کۆتایی کتێبەکەی (المبادئی الأولی) بە ڕستەیەك دێنێ و دەڵێت: ژیان پڕوپووچ و بێمانایە و شایەنی مانەوە نییە.

هەروەها فەیلەسووفی مولحید (شۆپنهاوەر) پێی وایە خۆشییەکانی دنیا هەموویان پڕوپووچن و دنیا بە هەموویەوە کە هەوڵی بۆ دەدرێ فاشیل و بێهوودەیە و جێی هیوا و ئومێد نییە.

هەروەها فەیلەسووفی مولحید (سارتەر) پێیوایە بوون هەمووی لە چوارچێوەی قەلەق و ئازار و نەهامەتی و ناخۆشی و ماندوویی و بێهوودەیی و بێهیوایی و بێئەمەلیدا دەسووڕێتەوە.

خۆشەویستان بینیتان چۆن ئیلحاد مرۆڤ سووك و بێئامانج و بێهیوا و بێئومێد دەکات، یەکسانی دەکات بە حەیوانێکی بێئامانج و بێهیوا.

بەڵام لە لایەنی باوەڕدا مرۆڤ ئامانجدارە و بەهیوا و بەئەمەل و بەڕێز و خۆشبەخت و گەشبینە.[١]

---

(١) بۆ ئەم وتانە بگەڕێوە بۆ (کواشف زیوف فی المذاهب الفکریة المعاصرة) عبد الرحمن حسن حبنكة الميداني (٥٥٩-٥٦٢).




## وەسوەسەی ئیمانی و عەقیدەیی و فکری

چەندان کەس پێیان وتووم: توخوا بەفریامان وەرە، ئیمانمان لەدەستدا! بڕوامان بە خوا نەما! هی وا هەبووە وتوویەتی: خۆم دەکوژم، با ڕزگارم بێت لەم گێژاوە! هی وا هەبووە وەسوەسەکەی گەیشتووە بە ڕادەیەك کەوتۆتە گومان لە بوونی خۆشی نەك هەر لەبوونی خودا!

وەسوەسەی عەقیدەیی: کۆمەڵە بیرۆکەیەکە لەناکاو تووشی مرۆڤ دەبێت و بەسەریدا زاڵ دەبێت، بێ ئەوەی خۆی بیەوێت و بەرەو ڕووی چوو بێت، وا لە مرۆڤەکە دەکات هەست بکات بێ باوەڕبووە، یان تووشی کوفر و شیرك بووە، یان... هیتر. وەسوەسەی عەقیدەیی هەر لەگەڵ مرۆڤدا بوونی هەبووە و شتێکی زۆر بێزارکەرە، هەندێك جار وا لەو کەسەکە دەکات پەنا بۆ خۆکوشتن ببات!

لە نموونەی ئەمەدا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویت: (يَأْتي الشَّيْطانُ أحَدَكُمْ فَيَقُولَ: مَن خَلَقَ كَذا وكَذا؟ حتَّى يَقُولَ له: مَن خَلَقَ رَبَّكَ؟ فإذا بَلَغَ ذلكَ، فَلْيَسْتَعِذْ باللَّهِ ولْيَنْتَهِ)[1]. واتە: (شەیتان دێت

---

(١) أخرجه البخاري (٣٢٧٦)، ومسلم (١٣٤) واللفظ له.

بۆلای یەکێك لە ئێوەوە و دەڵێت: کێ ئەمە و ئەمەی دروستکرد؟ هەتا دەڕوات و دەگاتە خوای گەورە و دەڵێت: ئەی کێ خودای دروست کرد؟ هەر یەکێك لە ئێوە گەیشت بەم پرسیارە با خۆی پەنا بدات بە خوای گەوە و واز لەو فکر و پرسیارە بهێنێت).

پێغەمبەر (ﷺ) دوو چارەسەری بۆ داناوە: خۆپەنادان بەخودا و کۆتایی هێنان بە وەسوەسە و پرسیارە نا عەقڵانی و نا مەعقولەکە. خوای گەورەش دەفەرمووێت: (وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ)[١]. واتە: (ئەگەر وەسوەسەیەکت لەلایەن شەیتانەوە بۆ پێشهات و ویستی لە خشتەت بەرێت و تووشی هەڵەت بکات، جا ئەوە تۆ پەنا بگرە بە خوا و پشت بەو ببەستە، چونکە بەڕاستی ئەو زاتە بیسەر و زانایە)، بەشبەحاڵی خۆم چەندان کەس پێیان وتووم: توخوا بەفریامان وەرە، ئیمانمان لەدەستدا! هی وا هەبووە وتوویەتی: خۆم دەکوژم، با ڕزگارم بێت لەم گێژاوە! هی وا هەبووە وەسوەسەکەی گەیشتووە بە ڕادەیەك کەوتۆتە گومان لە بوونی خۆشی، نەك هەر لەبوونی خودا!

## جیاوازی نێوان گومان و وەسوەسە

زۆر گرینگە جیاوازی بکرێت لە نێوان گومان و وەسوەسە دا، چونکە ئەگەر لێك جیانەکرێنەوە دوایی چاریش ناکرێت. گومان لە شتێکی تایبەت دەکرێت، بۆ نموونە: گومانی لە خودا

---

(١) [الاعراف: ٢٠٠]

هەیە، یان پێغەمبەرایەتی پێغەمبەران، یان زیندووبوونەوە، یان... هیتر، گومان پێویستی بە وەڵامی قەناعەت پێکەر هەیە و کەسی گومانکەر کەسێکی سرووشتییە و هەرکاتێك وەڵامەکەی وەرگرت، تەواو تەواو قەناعەتی دێت و ئەو حاڵەتەی خۆی جێدێڵێت.

بەڵام وەسوەسە کۆمەڵە ئەفکارێکی سەرقاڵکەری بێزارکەرە، کە زاڵ دەبێت بەسەر کەسەکەدا، زۆر جاریش لەسەر شێوەی گومان و پرسیار خۆی دەردەخات، لە ڕووکەشدا وەك کەسی گومانکەر وایە، بەڵام لە ناوەڕۆك و حەقیقەتدا تەواو تەواو جیاوازە، چونکە کەسی وەسواس حاڵەکەی تەواو نابێت و ئەگەر وەڵامیشی بدەیەوە، هەر بەردەوامە لەسەر حاڵەتەکەی خۆیی و ناتوانێت تێی پەڕێنێت، چونکە وەك باسمانکرد بەسەریدا زاڵبووە و لە ویست و ئیرادەی ئەو دەرچووە.

کەواتە ئەو کەسەی گومانی هەیە بە وەڵام کۆتایی بە گومانەکەی دێت و دەبێتەوە کەسێکی ئاسایی، بەڵام کەسی وەسواس بە وەڵام کۆتایی بە حاڵەکەی نایەت، چونکە شتێکی لائیرادییە و بەسەریدا زاڵبووە، و لە بنەڕەتیشەوە حاڵەتەکەی لەسەر بنەمای پرسیار و زانست و گەڕان بەدوای حەقیقەتدا دروست نەبووە. زۆر بە ڕاشکاوی دەتوانین بڵێین کەسی وەسواس نەخۆشە و زۆرجار پێویستی بە پزیشکی دەروونی و چارەسەری دەروونی هەیە.

جۆرێکی تری وەسوەسەمان هەیە لە شێوەی هەست و شعور و شتێکی لەناکاو هاتوو، وەك ئەوەی کەسەکە هەر لە خۆیەوە

هەست دەکات جنێو بە خوا دەدات، یان کوفر دەکات، یان وێنای خوای بۆ دێت بە وێناکردنێکی نابووت و ناشیرین و نەگونجاو، یان وێنەی پێغەمبەرانی بۆ دێت بە شێوەیەکی ناشیرین یان... هتد.

لە بەرەنجامی ئەوەوە ئەم کەسە نەخۆشە وای لێدێت لە هەموو شتێك دەترسێت، هەرچی بۆنی ئەوەی لێبێت ناتوانێت لێی نزیك بکەوێتەوە، زۆرجار لە گەڕان بەدوای وەڵامەکانیشدا دەترسێت، یان دەترسێت دەست بۆ پەڕتووکێك ببات کە وەڵامی گومانی تێدایە، یان وروژاندنی گومان. ئەوەی زۆر سەیرە ئەوەیە زۆربەی زۆری ئەو کەسانەی تووشی ئەم نەخۆشی و وەسوەسانە دەبن، ئامادە نین واز لە عیبادەت و پەرستشەکانیان بێنن، کە ئەمە خۆی خاڵێکی زۆر ئەرێنییە، چونکە هەست دەکەن ئەم حاڵەتەیان دژی دڵ و دەروونیانە و شتێکە تووشی عەقڵ و فکریان بووە بێ ئەوەی بیانەوت. بۆیە ئەمە نەخۆشییە و لە پزیشکی دەروونیدا پێی دەوترێت: «وەسوەسەی زاڵبوو - الوسواس القهری - - OCD».

### هۆکارەکانی وەسوەسەی عەقیدەیی و فکری:

ناتوانین بە دیاریکراوی هۆکارێکی دیاریکراو دیاری بکەین، هەرچەندە لە ڕووی پزیشکی دەروونییەوە زۆر شتیان دیاریکردووە، بۆ نموونە: کێشەی جینات، یان ویراسی، یان کێشەی عەسەبی، یان دەوترێت فشارێکی دەروونی لەناکاوە.

بەڵام بە کورتی دەتوانین بڵێین: زۆر کەس هەیە ئامادەیە بۆ ئەوەی تووشی ئەم هێرشە دەروونییە ببێتەوە، جا یان بەهۆی ئەم هۆکارانەوە یان بە هۆکارگەلی تر.

زۆرجار لە گومانێکەوە دەست پێدەکات، گوێی لە گومانێك بووە و تووشی ئەم وەسوەسەیە بووە، یان تووشی ڕووداوێك یان کارەساتێك بووە و لەوێوە تووشی بووە، یان تووشی زیانێك یان لەدەستدانی ئازیزێکی بووە و دواتر تووشی بووە. کە زۆرجاریش هەر لە خۆوە و بێ هیچ هۆکار و پێشەکییەك تووشی دەبێت.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا شەیتانی لەعین ڕۆڵێکی زۆری هەیە بۆ پەیداکردنی ئەم وەسوەسانە و بەردەوامی پێدانی. هەربۆیە قورئان و سووننە زۆر بەجوانی و ڕوونی باسی وەسوەسەیان کردووە و چارەسەرشیان بۆداناوە.زۆرجاریش ئەم جۆرە وەسوەسەیە لە دەستنوێژ و خۆشۆردنەوە دەستپێدەکات، ئەم کەسە تووشی وەسوەسە دەبێت لە دەستنوێژ یان خۆشۆردن یان... هیتر، دواتر سەر دەکێشێت بۆ وەسوەسەی فکری و عەقیدەیی و ئیمانی.

### کات و تەمەنی دەستپێکردنی وەسوەسە:

وەسوەسەی عەقیدەیی تەمەن و کاتێکی دیاریکراوی نییە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی لە تەمەنی نەوجەوانی (هەرزەکاری) و گەنجییەوە دەستپێدەکات، جاری وا هەیە ڕۆژێك دەخایەنێت، جاری واش هەیە مانگێك یان ساڵێك یان چەند ساڵێك دەخایەنێت،

زۆرجاریش دێت و دەڕوات، جار جار دێت و جار جار ون دەبێت، دواییش یان دەبێتە نەخۆشی دەروونی، یان لەناكاو كۆتایی دێت، زیاتر دەگەڕێتەوە سەر بەهێزی كەسەكان و خۆڕاگری و گوێ پێنەدانیان. ئەم جۆرە لە وەسوەیە ئاستێكی دیاریكراو ناناسێت، زۆرجار تووشی زانایەكی ئایینی دەبێت، یان قوڕئان خوێنێك، یان قوتابییەكی علومی شەرعی، یان دكتۆرێك یان فەیلەسوفێك یان... كەسیتر، ئەم جۆرە لە وەسوەسەیە زۆرجار لە نوێژدا یان لە كاتی قورئان خوێندا یان... كاتی تر تووشی دەبێت. وەسوەسەی عەقیدەیی لە قەلەق و هەستكردن بە كەموكوڕی دەروونی و... پەیدا دەبێت و بە گوێپێدان و گوێگرتن بۆ گومان و شوبهە و خوێندنەوەی گومان زیاد دەبێت.

## ئایا كەسی وەسواس گوناهبار دەبێت؟

ئەوەی زۆر گرینگە بزانرێت ئەوەیە كە ئەم وەسوەسەیە هیچ گوناهبارییەكی تێدا نییە و كەسەكە پێی گوناهبار نابێت[١]، چونكە زۆرجار كەسەكە هەست بە گوناهـ دەكات و پێیوایە تاوانێكی گەورەی كردووە، بەتایبەت لەو جۆرەی كە لە دەوونییەوە بەبێ ویستی خۆی جنێو بە خوا دەدات یان وێنای دەكات بە وێنایەكی دزێو و نابووت و ناشیرین.

---

(١) (صحيح ابن حبان: ١٤٦).

### وەسوەسە لە ناو هاوەڵانی پێغەمبەردا (ﷺ) هەبووە؟

بەڵێ هەبووە:

(إنَّا نَجدُ في أنْفُسنا ما يَسُرُّنا أنْ نتكَلَّمَ به، ولا أنَّ لنا ما طلَعَتْ عليه الشَّمسُ. قال: أوَجَدتُم ذلكَ؟ قالوا: نَعَمْ. قال: ذاك صَريحُ الإيمانِ)[1].

(جاءَ ناسٌ من أصْحاب النبيِّ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ، فَسَأَلُوهُ: إنَّا نَجدُ في أنْفُسنا ما يَتَعاظَمُ أحَدُنا أنْ يَتَكَلَّمَ به، قالَ: وقدْ وجَدْتُمُوهُ؟ قالوا: نَعَمْ، قالَ: ذاكَ صَريحُ الإيمانِ)[2]. واتە: (هەندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) هاتن بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) و پرسیاریان کرد: ئێمە شتی وا بەدەروونماندا دێت زۆر گەورە و کارەساتە و کەسمان ناتوانێت بیهێنێتە سەر زمانی، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی هەستتان بەمە کردووە؟ وتیان بەڵێ، فەرمووی: ئەوە ئیمانە و ئیمانێکی ڕاشکاوە و لە ئیمانەوەیە.)

سەیر بکەن پێغەمبەر (ﷺ) ئەم گومانە کوفریانەی بە ئیمانی ڕاشکاو ناساندووە، چونکە وایە کەسەکە ئەم شتەی بە دڵ و دەروونداا دێت، بەڵام زۆر پێی نامورتاحە و زۆری پێ ناخۆشە و

---

(١) أخرجه مسلم (١٣٢)، وأبو داود (٥١١١)، والنسائي في ((السنن الكبرى)) (١٠٥٠٠)، وأحمد (٩٦٩٤) واللفظ له.

(٢) رواه مسلم: ١٣٢.

لێی بێزاره و لێی ڕاده‌كات و ئومێد ده‌كات تێی په‌ڕێنێت، كه‌واته دیاره كه‌سه‌كه ئیماندارە. ئه‌وه‌ی زۆر سه‌یره پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) له‌و سه‌رده‌مه‌دا پێش زانستی پزیشكی ده‌روونی كه‌وتووه و ئه‌م جۆره له وه‌سوه‌سه‌یه‌ی به وه‌هم و شتێكی هیچ داناوه!

كه‌واته وه‌سوه‌سه‌ی عه‌قیده‌یی و زاڵ هه‌رچۆنێك بێت هه‌ر وه‌همه و شتێكی هیچه.

## وه‌سواس پاداشت وه‌رده‌گرێت له‌سه‌ر ئارامگری و ناڕه‌حه‌تییه‌كه‌ی؟

به‌ڵێ، كه‌سی وه‌سواس پاداشت وه‌رده‌گرێت له‌سه‌ر ئارامگری و ناڕه‌حه‌تییه‌كه‌ی، چونكه جۆرێكه له تاقیكردنه‌وه و به‌ڵا و ناخۆشی و نه‌خۆشی، وه‌ك پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ده‌فه‌رموویت: (ما يُصيبُ المُسْلمَ، من نَصَب ولَا وصَب، ولَا هَمٍّ ولَا حُزْن ولَا أذًى ولَا غَمٍّ، حتَّى الشَّوْكَةِ يُشَاكُهَا، إلَّا كَفَّرَ اللَّهُ بهَا من خَطَايَاهُ)[١].

هه‌روه‌ها فه‌رموویه‌تی: (ما من مُصيبَةٍ تُصيبُ المُسْلِمَ إلَّا كَفَّرَ اللَّهُ بها عنْه، حتَّى الشَّوْكَةِ يُشاكُها)[٢]. وه فه‌رموویه‌تی: (ما يزالُ البلاءُ بالمؤمن والمؤمنةِ في نفسِه وولدِه ومالِه حتَّى يلقَى اللهَ تعالَى وما عليه خطَيئةٌ)[٣].

---

(١) أخرجه البخاري (٥٦٤٢) واللفظ له، ومسلم (٢٥٧٣).

(٢) أخرجه البخاري (٥٦٤٠)، ومسلم (٢٥٧٢).

(٣) أخرجه الترمذي (٢٣٩٩) واللفظ له، وأحمد (٧٨٥٩).

هەروەها (ما من مُسْلم يُصيبُهُ أذًى؛ مَرَضٌ فَما سِواهُ، إلَّا حَطَّ اللَّهُ له سَيِّئاتِهِ، كما تَحُطُّ الشَّجَرَةُ ورَقَها)[1].

هەموو ئەم فەرموودانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی موسڵمان لەسەر ئازار و بەڵا و تاقیکردنەوە و ناخۆشی و نەخۆشی پاداشت وەردەگرێت، هەتا ئەگەر ئازار و ناخۆشییەکە چقڵێك بێت کە لەپێی ڕادەچێت، جا چجای ئەوەی مرۆڤ تووشی ئەم نەخۆشییە دەروونییە سەختە ببێت و بەردەوام ئازاری بدات. کەواتە ئەم جۆرە نەخۆشییە هەم پاداشتی لەسەر وەردەگیرێت، هەمیش دەرگایەکە بەرەو یەقین و دڵخۆشی، چونکە ئەم مرۆڤە دوای ئەم نەخۆشییە تام لە دین و ئیمان دەکات، وەك ئەو کەسەی خواردنێکیان لێ قەدەغە کردووە و پاشان کە ڕێی پێدەدەن و دەیخوات زۆر تامی لێدەکات[2].

### جۆرەکانی وەسواس:

**١.** هەیە ئاشکرای ناکات و لە دەروون و فکری خۆیدا دەیهێنێت و دەیبات.

**٢.** هەیە ئاشکرای دەکات و دەچێتە لای کەسێك.

**٣.** هەیە وەسوەسەکەی هەندەکییە (جزئی)یە، بۆ نموونە: تەنها لە خودا یان لە زیندووبوونەوە وەسوەسەی بۆ دێت.

---

(١) أخرجه البخاري (٥٦٦٠)، ومسلم (٢٥٧١).

(٢) محاضرة: أسرع علاج لوسواس العقيدة. د. هيثم طلعت.

**٤.** هەیە وەسوەسەکەی گشتی و گشتگیرە (کلی)یە، واتە: وەسوەسەی بۆ دێت لە بارەی هەموو شتێکەوە، واتە لە خودی خۆشی، بڕوای بە بوونی خۆشی نامێنێت، یان لێی دەکەوێتە گومانەوە.

## چارەسەکانی وەسوەسەی عەقیدەیی و فکری:

**١.** خۆپاراستن لە گومان و گوێ بۆ گرتنی و خوێندنەوەی، بەتایبەت پێش ئەوەی مەناعە و بەرگری ئیمانی و فکری و عەقیدەیی پەیدا کردبێت، واتە نابێت نە گوێی بۆ بگرێت، نە بیخوێنێتەوە، نە لەگەڵ ئەو کەسانەشدا هەستێت و دانیشێت کە ئەم گومانانە دەوروژێنن.

**٢.** خۆسەرقاڵکردن و نەهێشتنی کاتی بەتاڵ و فەڕاغ لە ژیاندا، بەتایبەت خۆسەرقاڵکردن بە کار و پیشە و بەدەستهێنانی زانست و...هیتر، بەشێوەیەك کەسەکە کەمترین کاتی فەڕاغی هەبێت و مەجالی ئەوەی نەمێنێت بیر لەم وەسوەسانە بکاتەوە.

**٣.** لەخۆگەورەنەکردن و نەترسان لێی، نابێت وەسوەسەکان لەخۆی گەورە بکات، یان لێیان بترسێت، چونکە ئەگەری هەیە بەسەریدا زاڵ بین.

**٤.** سەردانیکردنی کەسی شارەزا و لێهاتوو لە بواری گومان و وەڵامی گومانەکاندا.

**٥.** سەردانیکردنی پزیشکی دەروونی لە کاتی هەستکردن بەوەی کە بەرەو نەخۆشی دەروونی دەڕوات، چونکە ئەم بابەتە بەشێکی

پەیوەندی بە پزیشكی دەروونی هەیە و عیلاج و حەب و چاسەری خۆشی هەیە.

**٦.** هاوڕێی باش و چاك.

**٧.** دوعا و عیبادەت و پەرستش و قورئان خوێندن و... هیتر.

**٨.** وازنەهێنان لە عیبادەت و پەرستش و بەردەوام بوون لەسەریان.

**٩.** گوێ پێنەدان و وازهێنان و دووركەوتنەوە و بیرلێنەكردنەوە.

**لەكۆتـــاییدا:**

**١.** ئەگەر تووشی ئەم نەخۆشییە بووی خەم مەخۆ و گوێی پێمەدە و خۆت سەرقاڵ بكە و دڵنیابە پاداشتی لەسەر وەردەگریت.

**٢.** نەكەی تەسلیمی ببی و چۆك دابدەیی و بڕوخێی، چونكە دڵنیابە كاتێكی كەمە و كۆتایی دێت.

**٣.** ئەم تاقیكردنەوەیە بە نیعمەتێك بزانە بۆ زیاتر لەخوا نزیك بوونەوە و تامكردن لە ئیمان و عیبادەت، هەروەها زیاتر بەهێزبوونی عەقیدە و ئیمان بە خوادا و هەموو بنەماكانی ئیمان.



## چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ گومانە هزرییەکاندا



بنەماکانی چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ گومانە هزرییەکاندا سێ جۆرن:

١. چەند بنەمایەك بۆ خۆپارێزی لە گومانەکان.

٢. چەند بنەمایەك بۆ مامەڵەکردن لەگەڵیاندا.

٣. چەند بنەمایەك بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵیاندا.

### جۆری یەکەم: چەند بنەمایەك بۆ خۆپارێزی لە گومانەکان:

١. بەهێزکردنی بیروباوەڕ و فیکر بە بەڵگەی ئەقڵی و لۆجیکی.

٢. دروستکردنی ئەقڵی ڕەخنەگرانە.

٣. شارەزایی باش لە زانستە ئیسلامی و شەرعییەکان.

٤. سپاردنی بابەتەکان و گومانەکان بە کەسانی پسپۆڕ و دوورکەوتنەوەی کەسانی ناپسپۆڕ.

٥. شارەزابوون لە بەهەڵەبردنی لۆجیکی (المغالطة المنطقية).

٦. خوێندنەوە و بەدواداچوون بۆ وەڵامی گومانەکان لە کتێب و سەرچاوە بەهێز و باوەڕپێکراوەکان.

**٧.** بەشداری کردن لە خول و... هتد، کە تایبەتن بە شیکردنەوەی ڕووحی ئیسلام و وەڵامدانەوەی گومانەکان.

**٨.** عیبادەت و پەرستش و پاڕانەوە و دوعا و پتەوکردنی پەیوەندی لەگەڵ خودای گەورەدا.

**جۆری دووەم: چەند بنەمایەك بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ گومانەکاندا:**

**١.** گەڕان و لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون بۆ وەڵامی گومان و پرسیارەکان.

**٢.** بەکارهێنانی ئەقڵی ڕەخنەگرانە و تەسلیم نەبوون بۆ گومان و زانیاری و ڕەخنەکان.

**٣.** پرسیارکردن لە کەسانی پسپۆڕ و دانیشتن و گفتوگۆکردن لەگەڵیاندا.

**٤.** مامەڵەی جوان و مەقاسیدییانە لەگەڵ دەقەکاندا.

**٥.** گەڕانەوە و لاکردنەوە بە لای وەڵامە پێشووەکان لە هەمان بابەتدا.

**٦.** پەلەنەکردن و پشوودرێژی لەگەڵ وەڵامی گومانەکاندا.

**٧.** تەسلیم نەبوون بۆ وەسوەسە و گەڕان بەدوای چارەسەرەکانی.

**جۆری سێیەم: چەند بنەمایەك بۆ گفتوگۆكردن لەگەڵ گومانەكاندا:**

**١.** ئاگاداربوون و شارەزابوون لە بەهەڵەبردنە لۆجیكییەكان (المغالطات المنطقية).

**٢.** بەدواداچوون بۆ بیر و فیكر و مەزهەب و بەڵگەی كەسی گفتوگۆ لەگەڵكراو.

**٢.** بەدواداچوون بۆ ڕاستییەتی وتە و بەڵگە و... هتد، كەسی گفتوگۆ لەگەڵكراو، چونكە زۆر جار شتی وا دەڵێن ئەسڵ و ئەساسی نییە.

**٣.** دیاریكردنی بابەتی گفتوگۆ لەسەركراو و پەلنەهاویشتن بۆ بابەتی جیاواز جیاواز.

**٤.** ڕێككەوتن لەسەر بنەمایەكی هاوبەش لە كاتی گفتوگۆكردن.

**٥.** داواكردنی بەڵگە لێیان لە كاتی بانگەشەكانیاندا.

**٦.** نەوەستان لە سنووری بەرگریدا[١].

---

(١) سابغات، أحمد السيد، بەدەستكارییەوە.

## هەندێ سەرچاوە بۆ شارەزابوون لە ئیلحـــاد

### نووسراو و وەرگێردراوە کوردییەکان

١. خوڕافەی ئیلحاد - د. عمرو شریف.

٢. ئیلحاد گرفتێکی دەروونییە - د. عمرو شەریف.

٣. بوونەوەر چۆن بەدیهات ؟- د. عمرو شەریف.

٤. گەشتی عەقڵ - د. عمرو شەریف.

٥. ئیمان و ئیلحاد - م. علی باپیر.

٦. خوداناسی ئایین ئیمان - م. علی باپیر.

٧. دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچکان - م. علی باپیر.

٨. گەنج و ئیلحاد - م. ئیکرام کەریم.

٩. پرسیارە وجودییەکان - م. ئیکرام کەریم.

١٠. سەرابی ئیلحاد - م. أحمد ڕازی.

١١. بوونی خودا - د. یوسف قەرزاوی.

١٢. ئەی کێ خودای دروستکرد؟ - د. سامی عامری.

١٣. حەقیقەتی ئیلاهی - أندریاس تزورتزس.

١٤. دژە ئیلحاد - د. أحمد خیری العمری.

١٥. ئیلحاد بوونیادنانی کۆمەڵگەیەکی ون- کۆمەڵێك نوسەر.

**١٦.** کتێبەکانی مامۆستا مەلا موحممەدی مەلا صالحی شارەزوری، بە تایبەت تەرازووەکان.

**١٧.** هەموو کتێبەکانی دوکتۆر موستەفا مەحمود، بەتایبەت ئێستا سیلسەلەیەکی وەرگێڕدراراوە و بە یەکەوە دەفرۆشرێ.

**١٨.** سەرابستانی بیردۆزی پەرەسەندن - کۆسار ڕەئوف مەعروف.

**١٩.** پەیامەکانی نوور - مامۆستا سعید نورسی.

**٢٠.** گەڕی گەردوون، دوکتۆر محمد باسل الطائی.

**٢١.** وەهمی ئیلحادی زانستی، دوکتۆر محمد باسل الطائی.

**٢٢.** پاکانەی هەبوون- موحەممەد صاڵح- ئاستانە.

زۆرێك لە ڕۆمانەکانی ناوەندی ئارا، کە لە تورکییەوە وەریانگێڕاون، بەتایبەت ئەوانەی بۆ منداڵان و هەرزەکارانن.

وە هەروەها چەند مەرکەزێکمان هەیە کە زیاتر کار لەسەر ئیلحاد دەکەن، لە تیلیگرام کەناڵیان هەیە و زۆرێك لە کتێبەکانیان بە pdf داناون، سوودێکی زۆریان لێ دەبینرێت، لەوانە:

١- مرکز براهین.

٢- مرکز دلائل.

٣- مرکز تکوین.

٤- مركز التأصيل.

٥- مركز الفتح.

٦- مركز منتدى التوحيد.

## سەرچاوە عەرەبییەکان

١- براهين وجود الله - د. سامي عامري.

٢- براهين النبوة - د. سامي عامري.

٣- مشكلة الشر ووجود الله - د. سامي عامري.

٤- لماذا يطلب الله من البشر عبادته - د. سامي عامري.

٥- فمن خلق الله - د. سامي عامري.

٦- سابغات - أحمد يوسف السيد.

٧- محاسن الإسلام - أحمد يوسف السيد.

٨- ظاهرة نقد الدين في الفكر الغربي الحديث - د. سلطان بن عبدالرحمن العميري.

٩- شموع النهار - د. عبدالله بن صالح العجيري.

١٠- الأدلة العقلية والنقلية على أصول الاعتقاد - د. سعود بن عبدالعزيز العريفي.

١١- اختراق عقل - د. أحمد إبرهيم.

١٢- فتح الملك الرحيم في درء الإلحاد وبيان الصراط المستقيم - هيثم سمير عبدالحميد.

١٣- موسوعة الرد على الملحدين العرب - هيثم طلعت.

١٤- موسوعة بيان الإسلام - مجموعة من المؤلفين، ئەم كتێبە ٢٠٠ زانا دایان ناوە و وەڵامی ١٢٠٠ گومانی جۆراو جۆریان داوەتەوە، ئێستا چەند بەرگێکی وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردی، بەرنامە هەیە کە هەمووی بکرێ بە کوردی. موسوعة محاسن الإسلام ورد شبهات اللئام - أحمد بن سليمان بن أيوب وآخرون.

١٥- الجواب عن سؤال الشر - منتدى التوحيد.

١٦- الحكمة والتعليل في أفعال الله تعالى عند أهل السنة والجماعة، عرض ودراسة د. عبد الله بن ظافر بن عبد الله البكري الشهري.

١٧- شفاء العليل - ابن القيم الجوزي.

١٨- مفتاح دار السعادة - ابن القيم الجوزي.

١٩- المقصد الأسنى في شرح أسماء الله الحسنى - أبي حامد الغزالي.

٢٠- موقف العقل والعلم والعالم من رب العالمين وعباده المرسلين - مصطفى صبري شيخ الإسلام للدولة العثمانية.

٢١- النبأ العظيم - محمد عبدالله دراز.

٢٢- مدخل إلى القرآن الكريم - محمد عبدالله دراز.

٢٣- فلسفة الأخلاق - محمد عبدالله دراز.

٢٤- إثبات نبوة النبي - أبو الحسن اليزيدي.

٢٥- مختصر تاريخ الحقيقة - د. محمد الروسي.

٢٦- الفيزيائيون والخالق - عماد علي هلال.

٢٧- نقد إشكالات هيوم على مفهوم المعجزة - رضا زيدان.

٢٨- الإلحاد الديني في مجتمعات المسلمين ومذاهبه المعاصرة - د. صابر عبدالرحمن طعيمة.

٢٩- الإلحاد بين قصورين حقيقة الإلحاد بين القصور العقلاني والقصور المعرفي - ترجمة وتعليق د. مؤمن الحسن، د. عبد الله الشهري.

٣٠- الإلحاد في الغرب - د. رمسيس عوض.

٣١- وهم الشيطان، الإلحاد ومزاعمه العلمية - د. ديفيد بيرلنسكي.

٣٢- معالجة لأبرز المقولات المؤسسة للانحراف الفكري المعاصر. عبدالله بن صالح العجيري - د.فهد بن صالح العجلان.

٣٣- عزيزي الملحد: أسئلة الملحدين أمام العقل والعلم - أ.د.محمد محمد داود.

٤٣- تفكيك شبهات الملحدين في اثبات نبوة رسول الله صلى الله عليه وسلم - محمد بن فوزي الغامدي.

٣٥- ٤٠ خطأ في نظرية التطور - د.هيثم طلعت.

٣٦- مناظرة الملحدين - د.هيثم طلعت.

٣٧- كيف تدعو ملحدا - بوذيا - هندوسيا - كتابيا إلى الإسلام (سؤال وجواب) - د.هيثم طلعت.

٣٨- حوار حقيقي مع متنصرة خفايا وأسرار - د.هيثم طلعت.

٣٩- كهنة الإلحاد الجديد. د.هيثم طلعت.

٤٠- تخلص من إلحادك. د.هيثم طلعت.

٤١- شفاء لما في الصدور (جرعات علمية وفكرية ومعرفية للملحدين والربوبيين والماديين والباحثين عن الحق. د.هيثم طلعت.

٤٢- إما الإيمان أو الفوضى. د.هيثم طلعت.

٤٣- الإجابة (القرآن وأسئلتك الوجودي. د.مهاب السعيد.

٤٤- إنك على الحق المبين رؤى تأصيلية في تفكيك ظاهرة الإلحاد. محسن حسين عبدالله العواجي.

٤٥- يهدي الله لنوره من يشاء. مجموعة مؤلفين.

٤٦- خلق آدم .. ونظرية التطور (سلالة من طين). د.محمد علي البار.

٤٧- الإسلام يتصدى للغرب الملحد - د.محمد نبيل النشواتي.

٤٨- ظاهرة الإلحاد في المجتمعات الإسلامية - ناصر بن سعيد بن سيف السيف.

٤٩- ميليشيا الإلحاد (مدخل لفهم الإلحاد الجديد) - عبدالله بن صالح العجيري.

٥٠- لا أعلم هويتي؟ «حوار بين متشكك ومتيقن - د.حسام الدين حامد.

٥١- الإلحاد ( وثوقية التوهم وخواء العدم ) - د.حسام الدين حامد.

٥٢- ثلاث رسائل في الإلحاد والعلم والإيمان - عبدالله بن سعيد الشهري.

٥٣- نقد العقل الملحد (كيف يستدل ؟ وبماذا يستدل ؟ ولماذا يلحد؟) - د. خالد كبير علال.

٥٤- أفي الله شك؟ بحث في علاقة العلم بالإيمان - د.حمد المرزوقي.

٥٥- الحجج العصماء في نقض نظرية داروين في النشوء والارتقاء

- ابن خليفة عليوي.

٥٦- سباق نحو الله - د. أحمد بن صالح الغيث.

٥٧- صلاة ملحد - محمد حامد.

٥٨- الإلحاد وأسبابه - الصفحة السوداء للكنيسة - د.زينب عبدالعزيز.

٥٩- أوهام الملحدين أوهى من بيت العنكبوت - شحاتة محمد صقر.

٦٠- فلسفة الشك أطروحات العقل الفينومينولوجي وشواهدها في الفكر العربي المعاصر - أ.د.محمد بن سعود البشر .

٦١- مجلة كشف الأقنعة (العدد الأول).

٦٢- سرنا في الأرض .. ونظرنا .. لنعرف .. كيف بدأ الخلق - د.عمرو شريف.

٦٣- الإلحاد وسائله، وخطره، وسبل مواجهته - د.صالح بن عبدالعزيز بن عثمان سندي.

٦٤- خطة معرفية للعمل في ملف الإلحاد - د.حسام الدين حامد.

٦٥- فتاة الشك - كتاب يحوي سلسلة مقالات تحكي قصة فتاة تعيش عالما سريا من الشكوك في دينها - د.خالد منصور الدريس.

٦٦- الحق .. هدية لكل باحث عن الحق - أ.طارق شهاب.

٦٧- وهكذا يقود العلم أشرس الملاحدة إلى الإيمان .. رحلة عقل - نسخة مصورة - د.عمرو شريف.

٦٨- لن تلحد - نسخة مصورة - أبو عبدالرحمن بن عقيل الظاهري.

٦٩- كيف تدعو ملحدا - مدحت بن الحسن آل فراج.

٧٠- بناء الكون ومصير الإنسان - نسخة مصورة. هشام طالب.

٧١- ردود علماء المسلمين على شبهات الملحدين والمستشرقين (٥٠٠ سؤال وجواب في الرد على أهل الكتاب) - محمد ياسين.

٧٢- حوار بين مدرس ملحد وتلميذ مسلم طالب علم. خديعة التطور (الانهيار العلمي لنظرية التطور وخلفياتها الأيديولوجية) - هارون يحيى.

٧٣- لماذا الإسلام؟ - أبو محمد مور كبي.

٧٤- حدد مسارك - أيمن بن بهاء الدين السراج.

٧٥- تهافت الفلاسفة - أبو حامد الغزالي.

٧٦- الإسلام يتصدى للغرب الملحد - د.محمد نبيل النشواتي.

٧٧- العقيدة الإسلامية في مواجهة التيارات الإلحادية - د.فرج الله عبدالباري.

٧٨- بغية المرتاد في الرد على المتفلسفة والقرامطة والباطنية أهل الإلحاد من القائلين بالحلول والاتحاد - شيخ الإسلام ابن تيمية.

٧٩- من تاريخ الإلحاد في الإسلام - د.عبدالرحمن بدوي.

٨٠- الإلحاد أسباب هذه الظاهرة وطرق علاجها - عبدالرحمن عبدالخالق.

٨١- جهود المفكرين المسلمين المحدثين في مقاومة التيار الإلحادي - د.محمود عبدالحكيم عثمان.

٨٢- الله كتاب في نشأة العقيدة الإلهية - عباس محمود العقاد.

٨٣- الأدلة المادية على وجود الله - محمد متولي الشعراوي.

٨٤- للكون إله - د.صبري الدمرداش.

٨٥- المخ : ذكر أم أنثى ؟! - د.عمرو شريف.

٨٦- الأدلة العقلية النقلية على أصول الاعتقاد - سعود بن عبدالعزيز العريفي.

٨٧- الشيخ مصطفى صبري وموقفه من الفكر الوافد - د.مفرح بن سليمان القوسي.

٨٨- الله يتجلى في عصر العلم - مجموعة من العلماء الأمريكيين.

٨٩- العلم يدعو للإيمان - كريسي موريسون.

٩٠- الله يتحدى الملحدين .. أدلة معاصرة لإثبات وجود الله - د.محمد شيخاني.

٩١- الفكر المعاصر في ضوء العقيدة الإسلامية - أ.د.يحيى هاشم فرغل.

٩٢- صراع مع الملاحدة حتى العظم - عبد الرحمن حسن حبنكة الميداني.

٩٣- كواشف زيوف في المذاهب الفكرية المعاصرة - عبد الرحمن حسن حبنكة الميداني.

٩٤- الإسلام يتحدى - وحيد الدين خان.

٩٥- الدين في مواجهة العلم - وحيد الدين خان.

٩٦- الإلحاد وآثاره في الحياة الأوربية الحديثة - صالح إسحاق بامبا صالح.

٩٧- كيف بدأ الخلق - عيسى العرباوي.

٩٨- عقيدتنا في الخالق والنبوة والآخرة - عبد الله نعمة.

٩٩- قصة الإيمان بين العلم والفلسفة والقرآن - نديم الجسر.

١٠٠- النبأ العظيم - نظرات جديدة في القرآن - د.محمد عبدالله دراز.

١٠١- الدين بحوث ممهدة لدراسة تاريخ الأديان - د.محمد عبدالله دراز.

١٠٢- البراهين العقلية على وحدانية الرب ووجوه كماله - الشيخ عبدالرحمن السعدي.

١٠٣- الإلحاد : أسبابه، طبائعه، مفاسدة، أسباب ظهوره، علاجه - محمد الخضر حسين.

١٠٤- توفيق رب العباد في شرح كتاب تطهير الاعتقاد عن أدران الإلحاد للإمام الصنعاني عبدالعزيز الراجحي.

١٠٥- تلخيص كتاب : المعرفة في الإسلام مصادرها ومجالاتها للدكتور عبدالله القرني.

١٠٦- معنى الربوبية وأدلتها وأحكامها وإبطال الإلحاد فيها - محمد بن عبد الرحمن أبو سيف الجهني.

١٠٧- الأدلة على وجود الله تعالى - د.عمر بن سليمان الأشقر.

١٠٨- جنايات أرسطو في حق العقل و العلم - مظاهرها، آثارها، أسبابها - د. خالد كبير علال.

١٠٩- كيفية دعوة الملحدين إلى الله تعالى في ضوء الكتاب والسنة - د. سعيد بن علي بن وهف القحطاني.

١١٠- الإله الخالق ما بين تعظيم المسلمين وافتراءات النصارى والكاذبين، وإنكار الملحدين - محمد السيد محمد.

١١١- تحقيق فاضحة الملحدين وناصحة الموحدين للبخاري - محمد العوضي.

١١٢- عبدالله القصيمي .. وجهة نظر أخرى - سليمان بن صالح الخراشي.

١١٣- رحلة إلى باطن العقل .. بحث في الجدل المفتعل بين العقل والنقل - همام محمد الجرف.

١١٤- الفيزياء ووجود الخالق .. مناقشة عقلانية إسلامية لبعض الفيزيائيين والفلاسفة الغربيين - أ.د . جعفر شيخ إدريس.

١١٥- كواشف زيوف في المذاهب الفكرية المعاصرة - عبد الرحمن حسن حبنكة الميداني.

١١٦- الإرشاد إلى صحيح الاعتقاد والرد على أهل الشرك والإلحاد - الشيخ صالح بن فوزان الفوزان.

١١٧- درء تعارض العقل والنقل - شيخ الإسلام ابن تيمية.

١١٨- الرد على من عظم الفلاسفة الملاحدة - سمير بن خليل المالكي.

١١٩- قدم العالم و تسلسل الحوادث بين شيخ الإسلام ابن تيمية والفلاسفة - كاملة الكواري.

١٢٠- حركة العصر الجديد, د. فوز كردي.

١٢١- حركه العصر الجديد مفهومها ونشأتها وتطبيقاتها, هيفاء بنت ناصر الرشيد.

تێبینی: سەرچاوەکانی نووسینی ئەو کتێبە بریتییە لە زۆرێك لەو سەرچاوانەی لە سەرەوە نووسراون، بۆیە نەمویست دووبارە بیان نووسمەوە.



# بەرهەمەکانی نووسەر



## پەرتووکە چاپکراو و چاپنەکراوەکانی نووسەر

١. ئیسلام وەك خۆی

٢. ئیلحاد وەك خۆی

٣. هەستانەوەی ئوممەت

٤. نەخۆشییەکانی ئوممەت

٥. یاسا قورئانییەکان

٦. یاسا گەوهەریەکان لە فەرموودەکانی سەروەرمان.

٧. مانای ڕەوان بۆ واژەکانی قورئان

٨. ڕۆڵەی شیرینم

٩. پەڕەی گوڵ، وەڵامی گومانەکان لەسەر پرسەکانی ئافرەتان لە ئیسلامدا

١٠. فەلسەفە لەنێوان ئیسلام و خۆرئاوادا

١١. بوونی باڵا، ٣٠ بەڵگە لەسەر بوونی خودا

١٢. مەوسوعەی ڕۆشنبیری و فیکری ئیسلامی

١٣. ڕێبازە فەلسەفی و سیاسی و هزرییە هاوچەرخەکان
١٤. زانستی کەلام و گروپە کەلامییەکان
١٥. تێڕوانینە فکری و فەلسەفییەکان بەرامبەر خودا
١٦. ئیماننناسی
١٧. سیماکانی ئیسلام
١٨. الكافي في المنطق الإسلامي
١٩. الوجيز في شرح المقدمة الآجرومية
٢٠. تقريب المعاني في إيضاح وإعراب عوامل الجرجاني
٢١. لب العقيدة الإسلامية
٢٢. الكافي في شرح وإعراب عوامل البركوي
٢٣. تعلم النحو في خمسين يوما
٢٤. مختصر قواعد المقاصد
٢٥. المختصر الميسر في القواعد الفقهية
٢٦. مختصر الوجيز في أصول الفقه
٢٧. الشرح الجديد على متن البناء في علم الصرف
٢٨. الشرح الجديد على تصريف الزنجانی في علم الصرف
٢٩. الشرح الجديد على قطر الندى

٣٠. مختصر النحو الواضح

٣١. القياس بين علمي المنطق وأصول الفقه

٣٢. الإلحاد وجذوره الفلسفية

٣٣. المختصر الميسر في علم البلاغة. قسم البيان

٣٤. مدخل إلى الفكر المقاصدى ومقاصد الشريعة

٣٥. الشرح الجديد على متن إيساغوجى في علم المنطق

٣٦. القواعد الصرفية

٣٧. فقه الدعوة إلى الله

٣٨. الخلاصة في النحو

٣٩. الاستحسان وأثره على الفكر المقاصدي

٤٠. شرح العقيدة الطحاوية

لەگەڵ هەندێ پەرتووکی دیکە

## ناوەڕۆك

بەناوی خوای گەورەی بەخشندەی میهرەبان ............................ ٥
ئیلحــاد (ناباوەڕی) ................................................... ٦
پێناسەی ئیلحــاد (ناباوەڕی) (Atheism).................................. ٦
مـێژووی ئیلحــاد (ناباوەڕی) ........................................... ١٠
هەڵوێستەكان بەرامبەر بوونی خودا .................................... ٢٢
خودایی (الألوهی) (Theism) ............................................ ٢٣
ڕوبوبییەكان (الربوبیة) (Deism) ....................................... ٢٣
جیاوازی ئولوهی و ڕوبوبی: ............................................. ٢٤
بێباوەڕی (الالحاد) (Atheism).......................................... ٢٥
نازانمگەرایی (اللاأدریة) (Agnosticism) ................................ ٢٦
شتگەرا (الشیئیة) (Ietsism)............................................ ٢٧
بێموبالات و گرنگی نەدەر (اللااكتراثیة) (Apatheis) .................. ٢٨
یەكێتی بوون، تاكانەیی بوون (وحدة الوجود) (pantheism)...... ٢٩
سۆفستائی (السوفسطائیة) (sophism) .................................. ٣٠
بنەما فیكرییەكانی ئیلحاد (ناباوەڕی)................................... ٣١
جۆرەكانی ئیلحاد (ناباوەڕی) (أنواع الإلحاد)........................... ٣٦
مێژووی بزووتنەوەی سەردەمی نوێ ..................................... ٤٤
نابــــاوەڕی نــــوێ.................................................... ٤٨

دوو جۆرە سەرەکیەکەی ئیلحادی ناو فەیلەسووفان ..................٦٥
یەکەم: ئیلحـــادی یەقینی ..........................................٦٥
بـــارۆن دی هۆلباخ (١٧٢٣ - ١٧٨٩ ز).................................٦٥
فـــیوربـــاخ (١٨٠٤ _ ١٨٧٢ ز) ..........................................٦٩
دووەم: ئیلحـــــادی گومانی.............................................٧٥
دەیڤید هیۆمم (١٧١١ _ ١٧٧٦ ز).......................................٧٥
سپنســەر (١٨٢٠ _ ١٩٠٣ ز) ..........................................٨١
بەرتراند ڕاســل (١٨٧٢ _ ١٩٧٠ ز)......................................٨٣
ناباوەڕی (ئیلحاد) لە کوردستان.........................................٨٩
هۆکار و ئامرازەکانی ناباوەڕی...........................................٩٢
چارەسەرەکانی ئیلحاد .................................................١٠١
ئامرازەکانی بڵاوکردنەوەی ئیلحاد.......................................١١١
زیان و شوێنەوارەکانی ناباوەڕی.........................................١١٦
١- لەڕووی فیکری و ئەقڵییەوە: .........................................١١٦
٢- لەڕووی ڕووحی و دەروونییەوە:........................................١١٨
٣- لە ڕووی ڕەوشت و بەهاکانەوە: .......................................١١٨
٤- لە ڕووی تاك و کۆمەڵگەوە:...........................................١١٩
٥- لە ڕووی سیاسی و حوکمڕانییەوە: ...................................١٢٠
٦- لە ڕووی ئابووری و گوزەرانەوە: ......................................١٢٢
سروشتی کەسانی ناباوەڕ...............................................١٢٣
تایبەتمەندی کەسانی ناباوەڕی توندڕەو...................................١٢٦

نەخۆشی کەسی ناباوەڕ (The Atheist Syndrome) .............. ١٣٠
ئیلحاد و زانست................................................... ١٣٥
ئیلحاد و عەقڵ...................................................... ١٣٥
ئیلحاد و زگماك .................................................... ١٣٥
ئیلحاد و فەلسەفە.................................................. ١٣٦
ئیلحـــاد و ڕەوشـــت............................................... ١٣٧
بۆچی ئیلحاد دژی ڕەوشتە؟!.................................. ١٤٤
ئیلحـــاد و ئامـــانج ................................................ ١٥٣
ئیلحـــاد و هـــــیوا .................................................. ١٥٦
وەسوەسەی ئیمانی و عەقیدەیی و فکری................................ ١٥٨
جیاوازی نێوان گومان و وەسوەسە ................................... ١٥٩
هۆکارەکانی وەسوەسەی عەقیدەیی و فکری: ........................... ١٦١
کات و تەمەنی دەستپێکردنی وەسوەسە: ................................ ١٦٢
ئایا کەسی وەسواس گوناهبار دەبێت؟.................................. ١٦٣
وەسوەسە لە ناو هاوەڵانی پێغەمبەردا (ﷺ) هەبووە؟............. ١٦٤
وەسواس پاداشت وەردەگرێت لەسەر ئارامگری و ناڕەحەتییەکەی؟ .... ١٦٥
جۆرەکانی وەسواس: ............................................................ ١٦٦
چارەسەکانی وەسوەسەی عەقیدەیی و فکری:........................... ١٦٧
چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ گومانە هزرییەکاندا ..................... ١٦٩
جۆری یەکەم: چەند بنەمایەك بۆ خۆپارێزی لە گومانەکان: ......... ١٦٩

جۆری دووەم: چەند بنەمایەك بۆ مامەڵەكردن لەگەڵ گومانەكاندا:.... ١٧٠
جۆری سێیەم: چەند بنەمایەك بۆ گفتوگۆكردن لەگەڵ گومانەكاندا:... ١٧١
هەندێ سەرچاوە بۆ شارەزابوون لە ئیلحـــاد ......................... ١٧٢
بەرهەمەكانی نووسەر ......................................................... ١٨٥